


# پرسی جەستە
# "لە یارییەکی بوونگەراییدا".

عەبدولموتەڵیب عەبدوڵلا

سلێمانی - ٢٠١٢

ناوەڕۆک:

**ئافرەت و سێکسگەرایی لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا.**

**لە پێشەکی ئەو کتێبەدا هەوڵدەدەم قسە لە یەکێک لەو کتێبانە بکەم، کە چ وەک تیۆریزەکردن و چ وەک پراکتیکی کۆمەڵێک کاری لەخۆدا هەڵگرتووە، ئەو کۆمەڵە کارەش کۆمەڵێک نووسەرو توێژەری شارەزای بواری ئافرەتانی لە پشتەوە و (بینار ئیلکارکان) توێژەری تورکی لە بواری ژناندا بە ئامادەکردن و هەڵبژاردن و وەرگێرانیان بۆ سەر زمانی تورکی هەڵساوە و وەرگێری عەرەبی (موعین ئیمام) کردوویە بە عەرەبی. کتێبی (ئافرەت و سێکسگەرای لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا) یەکێکە لەو بەرهەمانەی کە بە یارمەتی ڕێکخراوی (ئافرەت لە پێناو ئافرەتدا) بە چاپ گەیەنراوە.**

**ڕێکخراوی ناوبراو ڕێکخراوێکە چاو بەو شوێنانەدا دەگێرێت، کە مافی ئافرەتانی تیا پێشێل دەکرێت، هەروەها ئەو کتێبە لە ڕێگای بەدواداچوون و توێژینەوە لەسەر ئەو ژنانەی، کە دوچاری ستەمی ڕەگەزایەتی بوونە، لە ڕێگای ئەو بێنرخکردنانەی، کە بە درێژایی مێژوو ڕووبەڕووی ئافرەتان دەکرێتەوە و ئافرەتانی لەو ڕێگاوە پێ پەراوێز کراوە، توانیویەتی پەنجە بخاتە سەر برینەکانەوە و لەوێشەوە هەوڵدەدات بە شێوازی تایبەتیانە (واتە هەر نووسەر و توێژەرێک بە شێوازی تایبەتی خۆی) ئازاری ئەو برینانە نیشانی مرۆڤی دنیا بدات.**

**وەک گوتمان لە پشت ئەو دەرکەوتنە چەندین نووسەر و توێژەری بواری ژنان دێتە قسەکردن و تیۆرداڕشتن، هەر لە فاتیمە ئەلمەرنیسیەوە بۆ لەیلا ئەحمەد و ئەلیفە ڕەفعەت و میرفت و بوسێنە شەعبان تا دەگاتە نەوال ئەلسەعداوی و عائیشە دوزکان و ئامادەکاری ئەو کتێبە،... هتد. هەر یەکێک لەوانە لە ڕێگای دواندن و توێژینەوە و بە دواداچوونی ئەو هەموو ستەم و بێنرخکردن و ڕاوەدوونانی ئافرەتان و قسەکردن لەسەر مێژووی چەوسانەوەی ئافرەت و دەسەڵاتی نێرایەتی بە تایبەتی لە کۆمەڵگای ڕۆژهەلاتیدا نووسین و توێژینەوەکانی خۆیان درێژە پێ دەدەن، هەر لەوێشەوە پێمان دەڵێن، کە سیستمی نێرسالاری لە ڕێگای حوکمکردن بە سەر ئافرەتانەوە دەیەوێت هێزی نێرایەتی خۆی بە سەر کۆمەڵگاو بەتایبەتی ژناندا پراکتیزە بکات. بە مانایەکی دیکە لە ڕێگای ئەو میکانیزمەوە تەحەکوم بە مافی ئافرەتانەوە دەکات و بە هەموو شێوەیەک دەیانچەوسێنێتەوە.**

**ئەوە و سەرەڕای ئەو توندو تیژییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابورییەی، کە پیاو بە دژی ژنان پیادەی دەکات، ئافرەت بۆتە وەرەقەیەک هەم بۆ سێکس و هەم بۆ بواری ئابوری و سیاسی. هەڵبەتە ئەو بەکارهێنانە نامرۆییانە جگە لەوەی پیاو وەک بوونەوەرێکی دڕندە دەخاتە ڕوو، لەبەرانبەریشدا ئافرەت وەک چەوساوەترین بوونەوەر (بەتایبەتی ڕۆژهەڵاتی) نیشان دەدات.**

**ئەگەر ڕەگەزی نێر بۆ ئەو هەموو چەوسانەوە و بێنرخکردنە قسەیەکی هەبێت، ئەو قسەیە هەر تەنها پەیوەندی بە قبوڵنەکردنی ڕەگەزێکی دیکەی جیاوازەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە کلتور و عەقڵانیەتێکەوە هەیە، کە خودی نێر بەرەو جۆرێک لە بیرکردنەوە ئاڕاستە دەکات، بێ ئەوەی ئەو هەموو گۆڕانکارییە گەورانەی دنیا، ئەو هەموو بەرەوپێشچوونانەی دنیا بتوانێت بە شێوەیەک لە شێوەکان، ئەو ئاراستانە لەگەڵ خۆیدا بەرەو گۆڕان بکاتەوە، ئەوەش پەیوەندی بە بنچینەی ئەو عەقڵانیەتە دایە، کە بەردەوام خۆی بە حەقیقەتی ڕەها دەزانێت، لەو کاتەدا هەموو گۆڕانکارییە مەعریفی و فەلسەفی و زانستی و تەکنۆلۆژییەکان لەلای ئەو، جگە لە لێدانی ئەو بنەما و پرنسیپە، یان جگە لە ئایدیۆلۆژیایەکی دژ، شتێکی دیکە نییە، واتە لای مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی فەندەمینتاڵی هەموو گۆڕانکاری و پێشکەوتنە مرۆییەکانی سەردەم لە پشتییەوە جۆرێک لە ئایدیۆلۆژیا ئامادەیە کە نیازی ڕەشکردنەوەی ئەوی لەخۆدا هەڵگرتووە, هەموو ئەوانەش ئەو زێتر سوورتر دەکات، نەک هەر هێندەش بەڵکو دەبێتە ڕاپۆرتێک بۆ بەرجەستەکردنی حەقیقەتەکانی، بە مانایەکی دیکە هەموو ئەو پێشکەوتنە مرۆییانە بەلای مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی فەندەمینتاڵ تەنها جەختکردنە لەو حەقیقەتە ڕەهایانەی، کە ئەو چەندان ساڵە بانگەشەی بۆ دەکات.**

کەواتە بەلای ئەوەوە هەموو ئەو بەرەوپێشچوونەی فیکر و فەلسەفە و تەکنۆلۆژیا و زانست و کەشفکردنەکانی دیکە جگە لە دووبارە بەرچاو خستنی حەقیقەتێک، کە خۆی بە کامڵ و تاک و تەنیا دەزانێت شتێکی دیکە نییە، ئەو حەقیقەتەش حەقیقەتێکە، کە پێیوایە جگە لەو حەقیقەتێکی دیکە وجودی نییە.

بەمجۆرە فەندەمینتاڵەکانی ڕۆژهەڵاتی لە شوێنی گۆڕینی دنیابینیەوە، گەڕانەوە بۆ ڕابردوو دەهێننە ناوەوە، گەڕانەوەش بۆ ڕابردوو لە نزیکترین پێناسەیدا پەیوەندی بە فەرامۆشکردنی فیکرو نەبوونی دنیابینی و نەبوونی جیهانبوونی هەیە، وەک چۆن پەیوەندی بە نەبوونی بابەتبووندایە. بە مانا (هابرماسی)یەکەش کاتێک فیکر دەکەوێتە فەرامۆشییەوە، ئیتر تەواوی ئازادی و ئامادەگی خۆی لەدەست دەدات و ناتوانێت پارێزگاری لە خۆی بکات. هەر فیکرێک نەتوانێت پارێزگاری لە خۆی بکات و نەتوانێت ئامادەگی خۆی بسەپێنێت، ئەوە وەک بابەتیش لە بری ئەوەی وەک بکەر دەربکەوێت، وەک ڕەمز ئامادە دەبێت. هەموو ئامادەگییەکی ڕەمزیانەش دەکەوێتە سەرووی واقیع و سەرووی پانتاییە حەڵاڵەکانەوە، بۆیە مرۆڤی فەندەمینتاڵ لە بری پەنابردن بۆ گفتوگۆی جیاواز و بیروڕای جیاوازو دنیابینی جیاواز، هێز ء توندوتیژی پراکتیزە دەکات، جا چ توندوتیژی فیکری بێ، یان توندوتیژی ڕەفتار ئامێزی دیکە.

لێرەوە ڕەنگە بتوانین بڵێین بەشێکی زۆری ئەو وسبەلێکراوە ئایینیانەی، کە بە کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتییەوە بەندن، وسبەلێکراوی سێکسگەراییین (زاراوەی سێکسگەرایی لەگەڵ هاتنە ئارای مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنەو دیموکراسیەت،... هتد. هاتە ناوەوە، ئەگەرچی ئەو وشەیە لە کلتوری ڕۆژئاوا لە (٢٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا بەکار هێنراوە، بەڵام پێش بە زاراوەبوونی تەنها بۆ گژوگیا بە مانای (جنس) کەڵکی لێوەرگیراوە، بەڵام دوای ئەوە وەک زاراوە تەعبیر لە کۆمەڵێک هەست و ڕەفتار و کاردانەوە سێکسییەکان دەکات، کە بەشێوەیەکی سروشتی لە ئینساندا کار دەکەن) بە مانایەکی دیکە ئافرەت بە گشتی ئایین سنوورەکانیان بۆ دیاری دەکات. کەواتە ئافرەت نەک هەر تەنها ناتوانێت لە کۆمەڵگادا بە شێوەیەکی ئەکتیڤ خۆی بنوێنێت، بەڵکو بە شێوەیەک کۆتوبەند کراوە، یان بە شێوەیەک پەراوێز کراوە کە حەقی ئەوەشی نییە بێتە نێو ژیانەوە.

کاتێک ئایین سنوورەکانی ژیان دیاری دەکات و هەموو گۆڕانکارییە مرۆییەکان بە دەرچوون و یاخی و هەڵگەڕاوە دەچوێنێت، ئیتر هەموو مافە مرۆییەکانیش دوچاری بنبەستبوون دەکاتەوە، هەموو جیاوازییەکانیش گۆشەوگۆش سەردەبڕێت، لێرەوە هەوڵدەدەم بڵێم هەموو ئەو گوتارە ڕۆژهەڵاتی و ئایینیانەی کە بانگەشە بۆ مافی مرۆڤ و مافی ئافرەت و جیاوازییەکان دەکەن، جگە لە گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، جگە لە بێنموودکردنی پێشکەوتنەکانی دنیای مۆدێرن و گاڵتەکردن بە داهێنانەکانی مرۆڤایەتی شتێکی دیکەیان پێ نییە، چونکە وەک گوتمان لە بنەڕەتدا ژیان دەخاتە ئایندەیەکی دواخراوەوە، ئایندەیەک کە دیار نییە، بێئەوەی هیچ ئەرزشێک بۆ ئێستای ئیبداع و ئێستای ژیان و جیاوازیەکان دابنێت. ئەوەش ڕاستەوخۆ پێمان دەڵێت کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی کۆمەڵگایەکی داخراوە، چونکە بەردەوام لە هەوڵی تەلبەندکردنی هێز و وزەکانی ژیاندایە، هەمیشە ترسی مەرگمان لەنێودا دەچێنێت، تاکو ژیانمان لەبەر چاو تاڵ بێت. فەندەمینتاڵی ڕۆژهەڵاتی پەیرەوی عەقڵ و بیرکردنەوەیەک دەکات کە ئەوەندە مەرگدۆستە، ئیتر ژیان و چێژی ژیان و ئیبداعی مرۆڤایەتی وەک شتێکی بێ نرخ سەیر دەکات. هەموو ئەوانەش ئەگەر بەشێکی زۆری بۆ نووچدان و بنبەستبوونی فیکری بگەڕێتەوە، بەشێکی بۆ ئەو مرۆڤە تەمبەڵەی خۆرهەڵات دەگەڕێتەوە کە ئەسڵەن هەستکردنی بە فەردانیەت تیا نادۆزیتەوە، هەمیشە لە چاوەڕوانی ئاڕاستەکردن دایە، ئەگینا هیچ جولەیەکی تێدا بەدی ناکەیت.

بە مانایەکی دیکە لەبەر ئەوەی لەمرۆی ژیان و ئیبداع و تەکنۆلۆژیادا هیچ بەشدارییەکی جیدی نییە، بۆیە بە ڕابردووەکانی خۆی دەنازێت و شانازی پێوەدەکات، بە دیوەکەی دیکەش هەمیشە سنوورەکانی ژیان بەدەوری خۆیدا تەسکتر دەکاتەوە و هەمیشە لە کوشتنی جیاوازییەکان بێ سڵکردنەوە بەردەوام دەبێت، بە مانایەکی دیکە هەموو ئەو هەوڵ و بزاڤە نوێخوازانەی کە بە نیازی بەشداریکردنی گفتوگۆو دنیابینی سەردەم دێنە ناوەوە بە کافر و هەڵگەڕاوە وەسفیان دەکات و دەیانخاتە دەرەوەی سنوورەکانی خۆیەوە و فتوای کوشتنیان بە سەردا دەدات.

نووسەران و توێژەرانی کتێبی ناوبراو بەشێک لە تیۆر و قسەکردن و دواندنەکانیان ڕاستەخۆ پەیوەندی بەو دەرهاوێشتەیە دایە و بە شێوەیەک لە شێوەکان ئەو سەردەمەشمان بیر دەخەنەوە، کە لەژێر سێبەری ئایین زۆر ناڕەواو

داپلۆسینەرانە مامەڵەیان لەگەڵ ژنان کردووە، هەروەک ستراتیژییەتی ئەو گوتارانەشمان بۆ شیدەکەنەوە، کە دەیانەوێت لە رێگای هەڵدانی ماف و مافی ئافرەتان و بە پیرۆز تەماشاکردنیان، سیاسەتی کۆنترۆڵکردن و خستنەناوەوە پراکتیزە بکەن، تاکو لەوێوە وسبەلێکراو و بێدەنگ کردنەکان زێتر برەو پێ بدەن و بەرجەستەتری بکەن.
نەوال ئەلسەعداوی یەکێک لەو ئافرەتانە بوو، کە کۆمەڵگای میسری هەوڵی زۆری بۆ بێدەنگکردنی دەدا، بەردەوام چالاکیەکانی پەراوێز دەکرد، نەک هەر هێندەش بەڵکو دووچاری زیندان و ڕاوەدوونانیشی کردەوە، بەڵام نەوال ئازایانە هەموو ئەو کۆتوبەندەی بڕی و ڕۆژانێک توانی ژان و ئازارەکانی ڕەگەزی مآ تا ئەو ئاستە بەرێت، کە ئیتر قبوڵکردنیان بێتە مەرجێک بۆ بەمرۆڤبوونی ڕەگەزی نێر و نێرایەتی لە ڕۆژهەڵاتدا.
سەرەڕای نووسەرانی دیاری وەک فاتیمە مەرنیسی، کە لە رێگای بەراوردکردن و تیۆرەکانییەوە توانیویەتی مرۆڤگەرایبوونی مێینە و سێکسگەرای بە شێوەیەکی زانستی وا بەرجەستە بکات، کە بێتە شوێنی سەرنجی فیکری مۆدێرن و پۆست مۆدێرنە، هەروەک کارەکانی هەر یەک لە لەیلا ئەحمەد و بوسێنە و میرفەت لە ڕووی بەدواداچوون و دواندن و توێژینەوە و بەرجەستەکردنی ژانوژوارەکانی ئافرەتان ڕۆڵی بەرچاویان لەو کتێبە بەردەکەوێت و لە زۆربەی توێژینەوەکانیان باس لە ڕەگەزایەتی و نێرسالاری دامودەزگاکان و ئایین و سیاسەت دەکەن. قسە لەوە دەکەن کە ئەگەرچی مێژوو زۆرجار باسی ئافرەتانیان هێناوەتە ناوەوە، بەڵام کەمترین پانتاییان بۆ قسەکردنی سێکسگەرایی تەرخان کردووە، ئەوەش وەک (دینیز کاندیوکی) نووسەر و توێژەر بۆی دەچێت ڕاستەخۆ پەیوەندی بە وسبەلێکراو و سێکسگەرایی مێینەوە هەیە، هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کراون جەخت لەو خاڵە دەکەنەوە و لەلایەک بە ئایین و لەلایەکی دیکە بە مەسەلەی کۆمەڵایەتی و سیاسەتەوە پەیوەستی دەکەن، لە حاڵەتێکدا کە بە سیاسەت پەیوەست دەکەن، دێنە سەر قسەکردن لە بارەی سیستمی حوکمرانی ڕۆژهەڵات و نێرایەتی ئەو حوکمرانە، بەڵام کاتێک بە ئایینی پەیوەست دەکەن، دێنە سەر ئیسلام و ئایینی ئیسلامی و لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە ئەو ترسەمان نیشان دەدەن، کە هەر یەک لە نێر و مآ لەو ڕووەوە دوچاری دەبنەوە، هەڵبەتە ئاستەکانی ئەو ترسەش بە ناوکۆییە سیاسی و ئاینیەکانەو بەندە، بۆ نموونە لە ناوکۆیی سیاسیدا مەسەلەکانی سێکسگەرایی و ئازادی مێینە بەدناوکردنی ئەو سیستمەی لێدەکەوێتەوە کە حوکمرانی بە دەستە، وەک چۆن لەناوکۆیی کۆمەڵایەتییەوە بەدناوکردنی دابونەریت و خێزان دەگەیەنێت، بۆیە ئایین کە لە ڕۆژهەڵات ژیان بە هەموو شێوەکان بەڕێوە دەبات، بۆ مەسەلەی ژنانیش بە کۆمەڵێک دوالیزمەوە دێتە ناوەوە، یەکێک لەوانە ئەو دوالیزمەیە کە لەلایەک کۆتەکانی ئافرەت توندتر و سنوورەکانی تۆختر دەکات، لەلایەکی دیکە ئافرەت وەک دایک بە پیرۆز سەیر دەکات و وەک هەڵگری دابونەریتەکانی کۆمەڵگا تەماشای دەکات، بە مانایەکی دیکە دەیەوێت بڵێت کۆمەڵگای باش ئەو کۆمەڵگایەیە کە ئافرەتەکانی شەرمن و ئابڕوودار و بێخەوشن، هەڵبەتە ئەوەش یەکێکە لەو ستراتیژییە سیاسییەی کە ژنانی پآ لە خشتە دەبردرێت، لەوێشەوە دەیانەوێت هەموو ئەو پەیوەندیانە کۆنترۆڵ بکەن، کە ژن بە ژیان و سیاسەت و مەسەلەکانی دیکە دەبەستێتەوە، سەرەڕای سێکس و سێکسگەرایی و چێژی سێکسی، چونکە نێر پێیوایە سێکس خزمەتێکە لە لایەن ژنانەوە بە پیاوان دەبەخشرێت، لە بنەڕەتدا بە مەبەستی دابنکردنی دڵنیایی و خۆشی پیاو ئەنجام دەدرێت، لێرەدا ئەسڵەن ڕازی بوونی ژنان لەبەر چاو ناگرن، چونکە ئەرکی ژنان ئەوەیە کە خۆیان بخەنە بەر خواستی مێردەکانیان، بەڵام وەک دەزانین پەیوەندی سێکسی تەواو ئەوەیە، کە جێگای ڕەزامەندی هەر دوو لا لەبەر چاو بگیرێت، چونکە لەبەر چاو نەگرتنی هەست و نیازەکانی یەکتر دەبێتە مایەی پشتگوآ خستنی یەکتر و کاریگەری قووڵی لەسەر پەیوەندی هاوسەرێتی هەیە.
سێکس وەک (مەسعود مەعتەمەد) دەڵێت بە لەزەتی تەواوەوە یەکێکە لە نیازە بنەڕەتییە سروشتییەکان کە دەبێتە هۆی دامرکاندنەوەی بەشێکی زۆری ئاڵۆزی دەروونی و هەڵچوونە دەروونییەکان و بە دەستهێنانی ئارامی دەروونی، ئەو دیاریدەیە دامرکێنەر و ئارامبەخشە سروشتییە ئەگەر بە شێوەی تەواو و بە گوێرەی پێویست ئەنجام بدرێت سەلامەتی لێدەکەوێتەوە...
لەلایەکی دیکە بزاڤە نیشتیمانییەکانیش دوور نین لەو بیرکردنەوەیە، یان بە مانایەکی دیکە ڕەنگدانەوەی ئایین زۆر بە جوانی لەمیانی بزاڤە سیاسیەکانیشەوە ڕۆڵی تایبەتی خۆی هەیە، جا چ بزاڤی ناسیونالی بێت یان چەپ و

ئەوانیدیکە لەسەر هەمان شێوازی حوکمرانی ئایینی و بە هەمان عەقڵانیەتی نێرسالاری جەخت لەوە دەکەن کە ڕەفتاری ژنانی مەقبول لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە بە فشار خستنە سەر ئافرەتان و دانانی مەرجەکانی گوتاری سیاسی و بە تایبەتی ناسیونالیزم بەندە، بە مانایەکی دیکە ژنان تەنها لەژێر ئەو گوتارەوە دەتوانن ئەکتیڤبوونی خۆیان بنوێنن و چالاکیەکانی خۆیان پرۆسیسە بکەن.

کەواتە ئەوە هەر تەنها ئایین نییە ژنان بە هەموو مانایەک دەچەوسێنێتەوە، بەڵکو ئەوە بزاڤی سیاسیشە پەیڕەوی لەو چەوسانەوەیە دەکات، بەو مانایە چەوسانەوەی ژنان هەر تەنها بە دیدی ئایینیەوە بەند نییە، بەڵکو تێکەڵەیەکە لە نایەکسانی ئایینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری. بێدەنگکردنی ژنان لە ڕووی قەدەغەکراوە ڕۆشنبیرییەکانەوە هێزی گەورەی هەژموونی کۆمەڵگای نێری لە پشتەوەیە، بۆیە پێویستە هەمیشە بزاڤی ئافرەتان خەمە تایبەتیەکانی خۆیان بخەنە پێش خەمە ئایینی و نیشتیمانیەکانەوە، چونکە هەتا ئافرەت لە لایەن پیاوانە وەک مرۆڤ تەماشا نەکرێت، چۆن چالاکیەکانی بە هەند هەڵدەگیرێت.

کەواتە پێویستە ئافرەت بەر لەوەی بیر لە ئازادکردنی نیشتیمان بکاتەوە، بیر لە ئازادکردنی خودی خۆی بکاتەوە، ئەوە بە نیسبەت پیاوانیش هەر ڕاستە، چونکە لە ڕۆژهەڵات پیاو بە قەد ئەوەی خۆی لەنێو مێگەلدا دەبینێتەوە، ئەوەندە وەک تاک هەست بە بوونی خۆی ناکات.

لێرەوە یەکێک لە کارە هەرە سەرەکیەکانی بزاڤی ئافرەتان لەوەدایە، کە بتوانێت ئازادییەکان بۆ خۆی دابین بکات، بتوانێت وەک مرۆڤ ئەرزش بۆ خۆی بگێڕ◌َ◌ێتەوە، بەر لەوەی ئەولەویەت بداتە مەسەلە نیشتمانیەکان، ئەولەویەت بداتە ئازادییە فەردییەکان و شوناس و مافە مرۆییەکانی خۆی، بەر لەوەی ئەولەویەت بداتە مەسەلەکانی ئایین، ئەولەویەت بداتە ڕەتکردنەوەی لاقەکردن بە هەموو ماناکانییەوە، ئەولەویەت بداتە چێژ و مەسەلەکانی دیکەی تایبەت بە ژیانی تایبەتی ئافرەتانەوە، نەک ململانێی سیاسی و ئایینی و ئایدیۆلۆژیەکانی دیکە، لە بیریشمان نەچێت زۆرجاران بە ناوی نیشتیمانپەروەری و ئایین و ناسیونالیزم و شۆڕشگێڕیەتی و مەسەلە سیاسیەکانی دیکە کۆمەڵێک نێر دێنە ناوەوە کە ئەسڵەن بڕوایان بە مافی ئافرەت و ئازادییەکانی ئافرەتان و سێسکسگەراییەوە نییە، نەک هەر هێندەش بەڵکو هەمیشە کار بۆ کۆنترۆڵکردن و بێنرخکردن و لەباربردنی هەموو چالاکیەکانی ژنان دەکەن، بۆیە بەرگریکردنی ژنان لەو مەسەلانە بەبێ وەدەستهێنانی ئازادی خۆیان ئەوندە بێمانا دەکەوێتەوە، کە هەمیشە قسەکردن لەو بارەوە بەرە و ناکۆکی و گۆشەگیری و ئیشکالیەتی دیکەی مرۆییمان دەکاتەوە.

فەلسەفەی جەستە.

بێگومان زمان سروشتێکی تەمومژاوی هەیە. لەمیانی لایەنە نادیارەکەی زمانیشدا ڕەگەزدۆزی بەرجەستە دەبێت، لێرەوەیە زمان گەمە دەکات و ئێمە گەمە بە زمان دەکەین. بە مانایەکی دیکە زمان گەمەکەری تێدایە وەک چۆن چەندین ڕێسا و یاسای تایبەت بە خۆی هەیە، کە هەندێکیان لەگەڵ یەکتر جیاواز و نێودژ دەکەونەوە. لەسەر ئەو بنەمایە دەمەوآ بڵێم هەر لە چاخی ناوەڕاستەوە بۆچوونی نێر و نێرسالاری دەڵێ: ئافرەتان لەپاش پیاوانەوە دێن، چونکە وشەی Female- مۆنپ) لە وشەی Male- مۆکر) وەرگیراوە.. یان چونکە لە وشەی لاتینی (Femina) هەڵهێنجراوە، واتای وشەی(Femina) ەش بە (ڕدنی إیماناً) دێت. ئەو دوالیزمییە هەر تەنها لە زماندا بەرجەستە نییە، هەڵبەتە مەبەستم وروژانی پرسیاری زمان پێش بیرکردنەوە دەکەوآ یان بیرکردنەوە پێش زمان دەکەوآ نییە. بەڵکو بەگشتی مەبەستم وروژاندنی دوالیزمەکانە، واتە جگە لەو دابەشکردنە (نێر/ مآ ) دەبینین فیکری یۆنان و فیکری سەدەکانی ناوەڕاست و ئایینەکانیش، جەستەی مرۆڤیان دابەشی دوو بەش کردووە، جەستە و ڕۆح، یەکەمیان هەڵگری لەناوچوون و دووەمیان نەمرییە. بێگومان وەک دەردەکەوآ ئەو تێڕوانینە بۆ جەستە لە ئاستێکی نزمی بیرکردنەوەدا خۆی دەبینێتەوە، بە بەراورد بە تێڕوانینی ئەمرۆ بۆ جەستە. وەک چۆن ئەگەر ئەمرۆ سەیری Womina-)امراە) بکەین، دەبینین لە دەستەواژەی Woe toman-) الویل للرجل) هەڵێنجراوە. وەک چۆن

ئەمڕۆ چەمکی جەستە وەک چەمکێکی سێنترالّی سەیر دەکرێت، لەو بارەشەوە بزاڤی ئافرەتان ڕۆڵی سەرەکییان لە بڵاوکردنەوەی ئاگایی لەبارەی تێگەیشتنی جەستەدا گێڕاوە. بەمجۆرە ئەگەر دوێنآ گوتاری فیکری بۆ تەماشاکردنی جەستە کەوتبێتە نێو سیستمی ئەخلاقییەوە، ئەوە ئەمڕۆ قسە لەوە دەکرێت کە جەستە وەک شتێکی ماددی لە بنەڕەتدا لە هەموو بەها ئەخلاقییەکانەوە دوورە، نە پیرۆزە و نە پیس، بەڵکو ئەوە بەهای ئەخلاقییە خۆی بە جەستەوە هەڵواسیووە، بێگومان ئەوەش بۆ سروشتی کۆمەڵگا و ڕۆشنبیریی نێرایەتی باو دەگەڕێتەوە.
کەواتە جەستە ئەو زیندانە نییە وەک فەلسەفەی کلاسیکی تێیگەیشتووە، هەر تەنها سەرقاڵی ئارەزووەکان و شەهوەتەکان بێت، ئەوە جەستە نییە مرۆڤ دەخاتە ئاستی ئاژەڵ و بەها مرۆییەکان دەخاتە لەرزەوە، ئەو بۆچوونە سلبییە بۆ جەستە وەک چۆن مرۆڤایەتی مرۆڤ وندەکات، بە دیوەکەی دیکەش لە مانای حەقیقی ژیان دوورمان دەخاتەوە. جەستە بۆ خۆی بە هەموو دەرکەوتە و ڕووخسارییەوە تەعبیر لە ژیان دەکات. ئەو زەوییە کە بە ژیانەوە پەیوەستمان دەکات، زەوی یەکەمە کە دەبێ لەوێوە پێشوازی لە ژیان بکەین و لەوێوە مامەڵەمان لەگەڵ ژیان ڕێکبخەینەوە. جەستە ئەو یەکەمەیە کە پەیوەستبوونمان بە ژیان ڕادەگەیەنێت، ئەو پردەیە کە ڕابردوو و ئێستا و داهاتوومان بەیەکەوە دەلکێنآ، جەستە شیاوێکی بێ کۆتاییە، بۆیە هەمیشە لە بزاڤی بەردەوامدایە، هەمیشە بەدوای ئاسۆ نەبینراوەکانەوەیە.

جەستە و دەروون.

ئەگەر وای دابنێین کە جەستە هەر تەنها بابەت بێ لەو شوێنەدا کە دەتوانین ببینین و دەستی لێبدەین و بە میتۆدی زانستییەوە دراسەی بکەین، ئەوە لە دیدی فینۆمینۆلۆژیدا ناتوانین لە پەیوەندی نێوان جەستە و دەروون تێبگەین، چونکە ئەو جەستەیەی کە بابەتە جەستەی من نییە، بەڵکو جەستەی ئەویدیکەیە وەک دەیبینین، یان ئەو لەشە خاوەیە کە لە ژووری توێکاری پزیشکی داوای توێکاری کراوە، بەڵام جەستەی تایبەتی من وەک (مۆریس میرلۆپۆنتی ١٩٠٨-١٩٦١) دەڵێت: دەرک ناکرێت، وەک چۆن بابەتە دەرەکییەکان دەرک دەکرێن، بەڵکو من دەژیم ئێستا لە ناوەوەدا زیندووم.
)ڕینیە دیکارتRene Descartes ،١٥٨٦-١٦٥٠ (جیاوازی لەنێوان جەستە و دەروون دادەنآ، هەریەک بە سەربەخۆ لە ئەویدیکە تەماشا دەکات، هەر یەکێکیشیان جەوهەری خۆی هەیە کە لە ئەویدیکە جیا دەبێتەوە. دەروون جەوهەری سەربەخۆی خۆی هەیە و ماهیەتەکەشی بیرکردنەوەیە. جەستەش جەوهەری تایبەت بە خۆی هەیە و ماهیەتەکەشی درێژبوونەوەیە. بۆ ئەو جیاکردنەوەیەش سآ بەڵگە دەخاتە ڕوو: بەڵگەی یەکەم، بەڵگەی هەنوکەییە، لە هێنانی ئەو بەڵگەیە دیکارت دەیەوآ بڵآ مرۆڤ دەشآ لە هەموو ئەو شتانەی دەوری داوە هەتا ئەو جەستەیەی کە تێیدا نیشتەجێیە خۆی ڕووت بکاتەوە و تەنها لە ڕێگای دەروونەوە بڵآ هەم، چونکە ئەو ڕووتکردنەوەیە بوونی ئێمە ڕەتناکاتەوە، کەواتە بوونی ئێمە لە دەروونەوەیە نەک جەستەی ماددییەوە. بەڵام ئەو جەستەیەی کە خۆمان لێداماڵی ناتوانآ دەروون ڕەتبکاتەوە، چونکە دەروون (جەوهەری) بوونە، ئەوەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی جەوهەری دەروون لە جەستە جیا بکەینەوە. بەڵگەی دووەم: بەڵگەی یەکتایی دەروونە، واتە دەروون قابیلی دابەشبوون نییە، دەروون بە یەکتا دەژمێردرێت و دابەش نابێ، ناتوانین دەروون بەش بەش بکەین، ئەگەرچی دەروون هەندآ شتی دەوآ وەک من دەمەوآ بگریم، من دەمەوآ بخەوم/ من دەمەوآ پێبکەنم... هتد، لە ویستە کردە شێوە جیاوازەکان، بەڵام هەموو ئەو ویستە کردە شێوە جیاوازانە لە ناوەڕۆکدا یەکن و بۆ تاکە دەروونێک دەگەڕێنەوە، خودی دەروون بە هەموو ئەو ویست و کردە جیاوازانە هەڵدەسآ، ئەوەش هەرگیز دابەشبوون نییە، بەڵکو ئەوە تاکێتی دەروون دەسەلمێنآ و تەواو پێچەوانەی جەستە دەکەوێتەوە، چونکە جەستە دابەش دەبێ بۆ هەردوو دەست هەردوو قاچ، سەر و سک،... هتد، ناشآ هەردوو دەست سەر بە هەردوو قاچەکان بن، وەک چۆن ناشآ سک بە هەردوو دەستەوە پەیوەست بێت، بەمجۆرە پەیوەستبوون بە بەشەکان جیاوازە و ناشآ بۆ یەک ڕەگەزییان بگەڕێنینەوە، ئەوەش یەکێکی دیکەیە لە جیاوازییەکانی نێوان جەستە و دەروون. بەڵگەی سێیەم: دەروون دەرک بە زانیارییە سادەکان دەکات، لێرە دیکارت مەسەلەی فەنابوون (مردن) و

(نەمری) دوای مەرگ بەرجەستە دەكات، جەستە دوای مردن قابیلی لەناوچوونە، بە پێچەوانەی دەروون كە بە نەمری دەمێنێتەوە، ئەگەرچی بەڵگەی ئەو مانەوەیەش نە لە پسپۆری ئەودایە و نە لە پسپۆری فەلسەفەدایە، بەڵكو شتێكە دەكەوێتە سەرووی عەقڵی بەشەرییەوە و هیچ بەڵگەیەكی زانستی بەدەستەوە نییە، پەنا بردنە بەر ئەو مەسەلەیە لە تایبەتمەندییەكانی لاهوتە نەک فەلسەفە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەسەلەی مردن و نەمری لای دیكارت بە یەكێک لە جیاوازییەكانی جەستە و دەروون دەژمێردرێت. كەواتە ئەوەی دیكارت پێی دەڵێ فیكری ڕووت یان سەربەخۆ ئەوەیە كە دەكەوێتە نێو دەروونەوە، بەرانبەر ئەوەش جەستە دیار و لەبەرچاوە و دەشێ بكەوێتە ژێر كاریگەری سروشت و دەوروبەر، جەستە دەوروبەر ئابڵوقەی داوە، جەستە پێویستی بە ڕاڤەكردن و لێكدانەوە نییە، چونكە دیارە و نادیار نییە، بە پێچەوانەی دەروون كە نادیار و تەمومژاوییە. بەیەكگەیشتنی نێوان جەستە و دەروونیش لای دیكارت شتێكی ڕوحییە، تا ئەوەی لە مردندا لێكجیا دەبنەوە .

جەستەی فینۆمینۆلۆژی بە هەموو مەبەست و نیازەكانییەوە ئەوەیە كە جەستە هەر تەنها جەستە نییە، هەر تەنها ئەندامێک نییە، كە فیزیۆلۆژیا و زانستی دەروونی ئەزموونگەرا تێیدا ڕەنگبداتەوە. وەک دەزانین جەستە مۆركێكی وجودی هەیە، بۆیە لەگەڵ شۆڕشی فینۆمینۆلۆژیادا تەواوی وێناكردنەكان بەرانبەر جەستە لە ڕەگەوە هاتنە گۆڕان، چونكە فینۆمینۆلۆژیا گەڕانەوەیە بۆ خودی شتەكان وەک چۆن هەن، هەڵبەتە یەكەم ئەزموونی مرۆڤ لەگەڵ ژیان لە ڕێگای جەستەوەیە، لە ڕێگای جەستەوە مرۆڤ تەعبیر لە خودی خۆی دەكات. (ژان پۆل سارتەر ١٩٠٥-١٩٨٠) دەڵێت:

جەستە ئەو ئاوازەیە كە لە ڕێگای هیچ ئامرازێكەوە ناتوانرێ تەعبیری لێبكرێت، تەنها لە ڕێگای خۆی نەبێت .

)سپینۆزا، باروخ ئۆر بندیک (١٦٣٢-١٦٧) SPINOZA, Baruch or Benedictفەیلەسوفی هۆڵەندی دامەزرێنەری ڕێبازی ئەندازەخوازی لە فەلسەفەدا، پێیوایە جەستە و دەروون یەک بوونن. ئەو بیركردنەوەیە لەوێوە هاتووە كە پێناسەی سپینۆزا بۆ (جەوهەر) تەواو پێچەوانەی پێناسەی دیكارت بۆ جەوهەر دەكەوێتەوە. ئەگەرچی دیكارت لەبارەی جەستە و دەروون لە ئەرستۆ و ئەفلاتوون جیا دەبێتەوە، لای دیكارت مرۆڤ دەروونی هەیە، جەستەش تەواو لە دەروون دەكات، جەوهەرێكی سەربەخۆی هەیە، كە دەجوڵێ، دواتر بە تەنیا لە جەستەدا چارەسەر دەبێ و دەجوڵێ، بە پێی ماددیبوونی، جولەی میكانیكی كە دەروون هیچ بەشدارییەكی نییە. دەروون بۆ خۆی سەربەخۆ نییە ئەوە مرۆڤە، جەستە جەوهەرە، پەیوەندی نێوان جەستە و دەروون، پەیوەندییەكی جەوهەرییە و جەوهەری سێیەم بەرهەم دەهێنێ ئەویش جەوهەرە، لە ڕێگای ئەویشەوە "بۆ خۆی سەربەخۆ دەبێت" ئەگەر دیكارت بنەمای پێناسەكەی بۆ وشەی "جەوهەر" ئەرستۆییانە بكەوێتەوە، واتە ئەوەی كە هۆكارە بۆ خود، لەو لۆژیكەوە "خودا" هەموو ئەوەبێ كە هەیە و خودا تاكە جەوهەر بێت، ئەوە جەوهەر پێكهاتووە لە یەک جەوهەر ئەویش خودایە، لێرەدا جەوهەر یەكە، بەڵام حاڵەتەكان فرە و بێ كۆتایین. بەو مانایەی ئەوەی هەیە ماهیەتی ئەوە، بێ كۆتا لە خەسڵەتەكان، بەڵام خەسڵەت لای سپینۆزا ئەوەیە كە عەقڵ لە جەوهەری فیكر و درێژبوونەوەدا دەركی دەكات. واتە سپینۆزا جیاوازی لەنێوان جەوهەر و وجودی بێ مەرج و دنیای شتەكان یان حاڵەتە بێ كۆتاییە فەردییەكان و هەر یەک لە جەستەی و فیكری دەكات. عەقڵی بێ كۆتا دەتوانێ دەرک بە جەوهەری بێ كۆتا بكات، لە هەموو شێوە و دەركەوتەكانیدا، بەڵام عەقڵی مرۆیی كۆتائامێز ناتوانێ وەک شتێكی بێ كۆتایی دەرک بە ماهیەتی جەوهەر بكات، تەنها لە دوو ڕووخساردا نەبێت، ئەویش درێژبوونەوە و فیكرە. ئەو دوو خەسڵەتەش دوو پێداویستین بۆ جەوهەر. هەموو خەسڵەتێكیش لەو خەسڵەتانە پێكدێت، مرۆڤ تەنها دوو خەسڵەت دەرک ناكات، ئەویش خەسڵەتی لێكدان (لێكدان لای سپینۆزا هەڵچوونی جەوهەرە). واتە ژمارە بێ كۆتاییەكان لە فیكر، لە سروشت، یان لێكدانێک كە خەسڵەتی درێژبوونەوەی لێكدانەكانە، یان لێكدانێكە لە لێكدانەكانی خەسڵەتێک كە جەستە دیاری دەكات بەوەی كە وەک خەسڵەتێكی دیكە لێكدانێكە لە لێكدانەكان كە مرۆڤ نایناسێ، مرۆڤ نایناسێ بەو مانایەی كە لێكدانێكە لە لێكدانەكانی خەسڵەتی فیكر و لێكدانێكە لە لێكدانەكانی خەسڵەتی درێژبوونەوە. بەرانبەر ئەوەش دەروون دوو لێكدان دیاری دەكات، پەیوەندی ئەو دوو لێكدانە (واتە درێژبوونەوە و فیكر) لێكدانێک بەرهەم دەهێنێ ئەویش مرۆڤە. مرۆڤ لای سپینۆزا ئەو مەخلوقەیە كە پەیوەستە بە حاڵەتی درێژبوونەوە (جەستە) و حاڵەتی فیكر (دەروون.(

مرۆڤ لە دووتوێی ئەو دوو حاڵەتەدا بەشێکە لە سروشت. سپینۆزا یەکبوونی ئیرادە و عەقڵ بەرز دەکاتەوە و پێیوایە ڕەفتاری مرۆڤ بەدوای پارێزگاریکردنی خود و بەرژەوەندییە کەسییەکاندا دەگەڕێت. ئەو فیکرە میسالییە لەبارەی ئازادی ئیرادە ڕەتدەکاتەوە و ئیرادە بەوە پێناسە دەکات کە هەمیشە لەسەر پاڵنەر وەستاوە. لە هەمان کاتتدا دەڵێت لەوانەیە ئازادی وەک ڕەفتارێک لەسەر مەعریفەی پێویست وەستا بێت. هەڵبەتە ئەو ڕاڤەکردنە بۆ ئازادی ڕاڤەکردنێکی ڕووتە و مێژوویی نییە .

سپینۆزا مرۆڤ وەک گواستنەوە بۆ مرۆڤ (لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤ) دیاری دەکات. پارێزکردن لە مانەوە، ناشآ کردەیەکی دەروون بێت و بکەوێتە دەرەوەی جەستەوە، هەر دەبێ جەستە و دەروون لە هەمان ئاستی هێز و کارداین بۆ پارێزگاریکردن لە مانەوە. بەمجۆرە سپینۆزا بەیەکەوەبوونی ئەنتۆلۆژی دەخاتە ڕوو، ئەویش ئەوەیە کە دەروون جەستەی بینراوە و لە لایەکی دیکە خەسڵەتی بیرکردنەوەی هەیە. دەروونی بینراویش خەسڵەتی درێژبوونەوەی جەستەی هەیە، ئەویش بوونە .

جەستە و لەش.

)هۆسرەل، ئەدمۆند) Edmund Husserl ١٨٥٩-١٩٣٨ (لە کتێبی (ڕامانەکانی دیکارتی) جیاوازی لەنێوان جەستە (الجسد) و لەش (الجسم) دەخاتە ڕوو. لەش لە ڕێگای کات و شوێن و دەرککردنە هەستییەکانەوە گرفتەکانی خۆی چارەسەر دەکات. هۆسرەل پێیوایە گرفتی لەش بەرە بەرە دەبێتە گرفتێکی بەدوایەکداهاتوو یان خولئامێز واتە: لەش، خوازە، ڕەمز... لەوێشەوە فەلسەفە هەوڵدەدات تەعبیری لێبکات و ئاڕاستەمان بەرەو دنیای خۆی دەبات، چونکە هەتا هەستیش بۆ خۆی دەکەوێتە نێو لەشەوە.

)ئیمانۆیل لیفیناسEmmanuel Levinas ١٩٠٦-١٩٩٥) دەڵێت: من لەشی من نییە، هەتا بە ئەویدیکەوە بەند بم، بەر لەوەی بە جەستەی خۆمەوە بەند بم. واتە بە ڕای لیفیناس ئەوە ئەویدیکەیە وا دەکات من لەدایک بم، جا ئەوە چ بە بیۆلۆژیاوە بەند بێت، یان لە ڕێگای دەستبازی و هەوەستەبازییەوە بێ .

ئەگەر شوێنگەی لەش ئەوەبێ کە شوێنآ داگیر دەکات، ئەوە لەشی مرۆڤ ئەوەیە کە تۆ پێکدێنآ و تۆی تێدا دەردەکەوێت، ئەو شوێنەی کە لێی لەدایک دەبیت، ئەو شوێنەیە کە ئارەزووەکانی تێدا دەردەکەوێت و دەردەکەوێت کە ئێمە چ جۆرە بوونەوەرێکی ئەخلاقین؟! ئەو ئاماژەیە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە کرۆمۆسۆمەکانی لەشی مرۆڤەوە دەکات، چونکە بیرکردنەوەیەک هەیە پێیوایە هەموو خەسڵەتە ئەندامییەکان فیزیاوین و دەکەونە ژێر کاریگەری(A.D.N) ، واتە جین و پرۆتین و سیفەت. بەو مانایەش دەوروبەر و ژینگەی تایبەت و فشاری دەوروبەر هیچ لەو سیفەتانە زیاد و کەم ناکات. هەر لەبەر هەندێش لە ١٩ی ئاداری ٢٠٠٣ (نیکۆلای سارکۆزی) فەڕەنسی یاسای ئاسایشی ناوەخۆی دەرکرد، کە جەخت لەسەر پەنجەمۆری تاوانبار دەکاتەوە.

وەک دەزانین کۆی ئەو بیروڕا جیاوازانە لەبارەی کرۆمۆس و ژینگە و فشارەوە دەکەونە نێو ئەنترۆپۆلۆژیای سروشتی و ڕۆشنبیریی و کۆمەڵایەتییەوە...، بەڵام سەدەی بیستەم جەختی لەسەر واقیع کردەوە و پێیوایە هەموو ڕووداوێک بە زەرورەت کردەیەکی کۆمەڵایەتییە، بەو مانایەش لەش بۆ خۆی لەڕاستیدا جگە لە بەرهەمێکی ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییە-ڕۆشنبیرییە شتێکی دیکە نییە. کەواتە هەر کۆمەڵگایەک خاوەنی لەشی خۆیەتی وەک چۆن خاوەنی زمانی خۆیەتی. هەر وەک زمان دەشآ لەش بکەوێتە ژێر ئیرادەی کۆمەڵایەتییەوە و دەشآ بکەوێتە ژێر ئیرادەی یاسا و کەش و کاریگەری دەرهاوێشتەکانی ڕۆژانەوە، لەگەڵ ئەوانەشدا لەش واقیعێکی کەسییە .

بزاڤی بونیادگەری و فۆکۆ وای دەبینین کە لەش هەر تەنها دەقێکە کە ڕۆشنبیریی نووسیویەتی، بەو مانایەش لەش دەبێتە خەیاڵ و کۆمەڵێک نواندنی عەقڵی و وێنەیەکی نەستی ئامادە. لەو بیرکردنەوەیەدا تاکە ڕێگایەک بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ڕۆشنبیریی باو هەڵوەشانەوەی ئەو دەقەیە لە ڕێگای بەرهەمهێنانی دەقێکی دیکەوە .

**جەستەی ئازاد.**

**ئەگەرچی مرۆڤ لەسەر زەوی دەژی، بەڵام هەر لە سوکرات و ئەفلاتوونەوە تا بە شۆڕشی فینۆمینۆلۆژیا دەگات، جەستەیان وەک زیندانی ڕۆح و لەوێشەوە بە ئارەزووەکانیان لکاندووە، دەمەوآ بڵێم ئەو دیدە مرۆڤ لە مانای زەوی دوور دەخاتەوە، بەڵام جەستە لای (نیتشە، فریدرچ ڤیاهیلم Friedrich Wilhelm Nietzsche ١٨٤٤-١٩٠٠ ) بە هەموو ڕووخسار و دەرکەوتەکانیەوە بۆ خۆی ژیانە و ڕووکارەکانی هێز دەنوێنآ، فیکرەی جەستە لە فیکرەی ڕۆح و دەروون جوانترە، جەستە زەوی یەکەمە، پابەندبوونمان بە ژیان ڕادەگەیەنێت، بۆیە پێویستە وەک چۆن پێشوازی لە ژیان دەکەین بە هەمان شێوەش جەستە بخەینە پێشەوە، چونکە جەستە پردێکە لەنێوان ڕابردوو و ئێستا و داهاتوودا، شیانێکی بێ کۆتاییە، بۆیە بێ وەستان هەمیشە لە جولەدایە و هەوڵی کەشفکردنی ئاسۆ نادیارەکان دەدات. بەمجۆرە ناتوانین بەبێ جەستە قسە لە بیرکردنەوە بکەین .**

**بێگومان مرۆڤ لە ڕێگای جەستەوە هەیە، ژیانیش بە دڵنیایی بەبێ جەستە دەکەوێتە نێو وەهمەوە، کەواتە ژیان ژیانی جەستەیە، لێرەوە بڕواهێنان بە جەستە جێگیرترە لە بڕواهێنان بە ڕۆح (دەروون). کەواتە ئەگەر ژیان لە دەرەوەی جەستە لە وەهم بکات، چۆن دەشآ لە دەرەوەی جەستە قسە لە بیرکردنەوە بکەین؟ ئەوە جەستەیە بیر دەکاتەوە، یان بەشێوەیەکی وردتر بیرکردنەوە لە جەستە هەڵدەقوڵآ. لەلای نیتشە جەستە کۆمەڵێک هێزە بەیەکەوە ئیرادەی هێز دروست دەکەن، هەر لەوێشەوە کە جەستە دەبێ بە خاوەنی ویستی هێز مژدەی مرۆڤی باڵا ڕادەگەیەنرآ و شیانی چوونە نێو بازنەکانی زەمەنی بەدوایەکداهاتوو و گەڕانەوەی ئەبەدی ڕێگای بۆ خۆش دەبێت .**

**وەک دەردەکەوێت نیتشە تێگەیشتنی تەقلیدی بۆ جەستە و ڕۆح بەتاڵدەکاتەوە، پێیوایە دەشآ هیچ پەیوەستبوونێک لەنێوان جەستە و ڕۆحدا بوونی نەبێت، واتە دوالیزمییەتی جەستە و ڕۆح هیچ بەهایەکی نییە.**

**پرسی جەستە.**

**لە یارییەکی بوونگەرایی.**

**) مۆریس بلانشۆ١٩٠٧-٢٠٠٣) ئەزموونی ئەدەبی و ئەزموونی مەرگ بەیەکدەچووێنآ، هەرگیز بەدوای دەلالەت و ماناوە نییە، وەک چۆن نکۆڵی لە تاک خوێندنەوەیی دەکات و پێیوایە یەک خوێندنەوەیی ناتوانآ ڕاڤەکردن بسازێنی. زمان لای بلانشۆ دەبێ پەیوەندی دوورکەوتنەوە لەگەڵ شتەکان، لەگەڵ ئەو شتانەی دەیەوێت ناویان لێبنآ، دابمەزرێنآ. بابەت ڕەتدەکاتەوە، چونکە ناونانی ئەو لەپێناو بە بابەبتکردنی شتەکان نییە، بەڵکو لەو ساتەی کە ناو لە بابەت دەنآ، دەیەوآ حەقیقەتی ماددی لێبسێنێتەوە، کەواتە ناونانی ئەو لەپێناو حەقیقەتیش نییە، بەڵکو لەپێناو ونبوون (مەرگ) دایە. بەو مانایە دەتوانین بڵێین نووسین لای ئەو پەنمانی بێدەنگییە لەنێو وشەدا، بەڵام پرسی ئێمە لێرەدا ئەوەیە ئایا پەنمانی زمان دەتوانآ وەک پێویست کردەیەکی ئیبداعی بەرجەستە بکات؟**

**زمان کۆمەڵێک وزەی جۆراوجۆر و ئەویدیکەی لەخۆدا هەڵگرتووە و لە ناوەوەی خۆی نوێنەرایەتی ئەو هێزانە دەکات، بەڵام چۆن دەتوانین جیاوازییەکانمان لە میانی بونیادی تاکە فیکرێکی دامەزراوی ڕەها (واتە زمان) دابمەزرێنین؟ ئایا عەقڵ دەتوانآ کۆی پێکهاتەکانی ئەو تاک لایەنییە، یان ئەو چەشنگیرییە هەڵوەشێنێتەوە و بۆشاییەک لەو نێوەدا دروست بکات، یان ئەوە جەستەیە لە ڕاکردنە بەردەوامەکانیدا دەتوانآ ئەو جێگیربوونە بروخێنآ؟ لەنێوان زمان وەک دامەزراو و جەستە وەک ڕاکردنی بەردەوام بەرەو نادیار، دەگەینە ئەو سەرەتا مەحاڵەی کە بلانشۆ ئاماژەی بۆ دەکات، یان دەگەینە ئەوەی کە نایگەینآ. ئەوەی کە نایگەینآ دەبێتە شوێنی لێوردبوونەوەی بەردەوام و بیرکردنەوە و پرسی بەردەوام.**

**کەواتە ئەوە بیرکردنەوەی بەردەوام و پرسی بەردەوامە دەشآ نادیار یان ئەوەی کە نایگەینآ ڕووناک بکاتەوە، ئەوە پرسی بەردەوام و لێوردبوونەوەیە لە گومانی بونگەرایی، خەونەکانمان ڕەنگینتر و جیاوازییەکانمان نیشان دەدات.**

بەڵام پرسیارکردن هەر تەنها دەرئەنجامێکی مەعریفی ئەو سەرنج و تێبینیانەی پێشوو نییە، لەمیانی ئەو پەند و قسە نەستەقانەوە هەڵناقوڵێ کە ڕۆژانە پرۆسیسەیان دەکەین، دەروشانەوەی چەمکی ئاگایی قەیرانە وجودییەکەمان، یان ڕاکردنمان بەرەو نادیار نییە... پرسیارکردن لەسەر دەمەتەقێی جێبەجێکردن و هەرەسهێنان ڕاست نابێتەوە، بەڵکو پرسیارکردن جەستەی ڕووتی ئێمەیە، جەستەی ڕووتی ئێمەش کیمایی لەدایکبوون و مردن، سنوورەکانی دیاری دەکات. بەبێ پرسیارکردن، بوون جگە لە یارییەکی قێزەوون شتێکی دیکە نییە، بەبێ پرسیارکردن، بوون جگە لە سەفەرکردنێکی زەبوونانە شتێکی دیکە ناکێشآ.

لەنێوان ڕەتکردنەوە و تەجاوزکردندا مەسافەیەکی زەمەنی هەیە، پرسیارەکان دادەڕێژآ و بناغەی چەمکەکان هەڵدەنێت، ئەزموونی ڕەتکردنەوە و تەجاوزکردن تەوەرەی هەموو بیرکردنەوەیەکی ئایندەخوازانە دادەمەزرێنآ. گرنگ ئەوە نییە بتوانین وەڵامی یەکلاکەرەوە بخەینە بەردەست، گرنگ ئەوەیە توانای پرسیارکردنمان هەمیشە سەوزبێ .

پرسیارکردن هەر تەنها ڕوخساری تراژیدی تاکە کەسیمان (لە پەیوەندی بە زەمان و مەرگ) هەڵناوەشێنێتەوە، بەڵکو لە ئاستی مەعریفیدا ئەوە ناوکۆیی (context) بونگەراییە وامان لێدەکات لە ڕێگای کۆمەڵێک مەرجی بیرکردنەوە و لێوردبوونەوە بگەینە بۆشاییەک کە سەرەتا و کۆتایی حەقیقەتی خودی مرۆیی دادەمەزرێنآ .

کەواتە کاتآ پرسیار دەکەین، مردن بەبیر خۆمان دەهێنینەوە، بەڵام نەک وەک یارییەک بۆ بێدەنگ بوون، بەڵکو وەک ئاسۆیەک بۆ دامەزراندن. دامەزراندنێک کە لە ڕێگای تەجاوزکردنەوە مەیسەر دەبێ، دامەزراندنێک کە تەواوی زمانی بیۆلۆژی و فیزیکی و ئایینزا و کەش و چارەنووس تەجاوز دەکات، دامەزراندنێک کە نوێنەرایەتی بۆشاییە بوونگەراییەکەمان دەکات. دامەزرانێک کە مردن دەکاتە پەراوێزی جیاوازی .

پرسیارکردن ئاسۆیەک بۆ زمانێکی دیکە دادەمەزرێنآ، ڕێچکەیەکی نوآ دەکێشآ، ئەو ڕێچکە نوێیە بەدوای میکانیزمی پەیوەستبوونی نێوان خود و پرسیار و مردندا دەگەڕێت. بەمجۆرە بۆشاییەکانی بوون لەنێوان تەقلیدی زمانەوانی کە وەک لۆژیکی نوێنەرایەتیکردن ماوەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ هەرەسهێنان و تەجاوزکردنەدایە. کەواتە هیچ مەرجێک بۆ خود لە دەرەوەی پرسیارکردن بوونی نییە، ئەگەرچی مردن بەرەو کۆمەڵێک جێبەجێکردنی جیاواز و بێ کۆتایی جەستە دەبێتەوە. بەو مانایەش ئەگەر ناوکی فەلسەفە پرسیارکردن بێ، ئەوە بۆشایی ماهیەتەکەی پێکدەهێنآ، هەر لە ڕێگای پرسیارکردنیشەوە دەگەینە ئەوەی کە لەگەڵ بوون کۆمان دەکاتەوە، دەمەوێت بڵێم ئەوەی لەگەڵ بوون کۆماندەکاتەوە، جگە لە بێدەنگی شتێکی دیکە نییە. بۆیە وەک چۆن لە جەستەی ڕووت دەترسین، سڵ لە بێدەنگیش دەکەینەوە، لە ڕووتی دەترسین، چونکە ژیان لەوپەڕی ڕووتی دامەزراوە، لە بێدەنگیش دەترسین، چونکە ماهیەتەکەی لە بۆشاییەوە هەڵدەقوڵآ. جەستەی ئازاد لە ڕێگای زمانی دابڕاو لە ناوکۆیی گشتی لە بوون نزیک دەبێتەوە، هەر ئەو زمانەشە کە گۆمی مەنگی یەقینەکان دەشڵەقێنآ و دامەزراوەکان دەروخێنآ و تەجاوزی بەڵگەنەویستەکان دەکات، هەر لەوێشەوە زمان بە ئازادییەوە پەیوەست دەبێ و تەعبیرەکانی فەزای ئازادانەی داهێنان لەخۆ دەگرآ، فەزای ئازادیش لە ڕێگای مرۆڤی ئازادەوە نەبێ مەیسەر نابێ.

) ژیل دۆلۆز Gilles Deleuze ١٩٢٦-١٩٩٥ (دەڵێ: ئێمە ناتوانین پرسیاری فەلسەفە چییە بخەینە ڕوو، تەنها ئەو کاتە نەبێت، کە پێشوازی لە پیری دەکەین و بە شێوەیەکی دەستلێدراو لەگەڵیدا دەدوێین. ئەوەش بۆ ئەوەیە تاکو وەک پێویست بە وردی قسەی لێبکەین، نەک وەک گوزەرکەرێک. هەڵبەتە وەک لە کتێبی (فەلسەفە چییە) لە نووسینی (دۆلۆز و گیتاری)دا هاتووە، فەلسەفە داهێنانی چەمکە (فەلسەفە هونەری پێکهێنان و داهێنان و دروستکردنی چەمکەکانە .(

ئەمڕۆ فەلسەفە ڕێسا و یاسایەکی جێگیر و چەسپاوی نییە، بەڵکو ڕەفتارێکە بەدوای دۆزینەوە و داهێنانی کۆمەڵێک چەمکدا دەخولێتەوە.. دۆلۆز پێیوایە فەلسەفە (نە لێوردبوونەیە و نە بیرلێکردنەوە و نە گەیشتنە، بەڵکو لە چوارچێوەی داهێنانی چەمکە تایبەتەکاندا دەخولێتەوە) بیرکردنەوە نییە، چونکە کەس پێویستی بەوە نییە فەلسەفە لە هیچ شتێک بیری بۆ بکاتەوە... لێرەوە هەست دەکەین ئێمە زۆر شتمان پێشکەش بە فەلسەفە کردووە کاتێک دەمانەوێت تەنها بێتە هونەری بیرکردنەوە و لە هەموو شتێکی دیکەی دەکەینەوە. فەلسەفە گەیشتن نییە (چونکە

فەلسەفە دوا پەنای بۆ بەیەکگەیشتن، لە پێناو کۆبوونەوەدا نییە) پێویستە بزانین کە (لێوردبوونەوە و بیرکردنەوە و گەیشتن) پانتایی مەعریفی پێکناهێنن، بەڵکو لەناو هەموو پانتاییەکاندا ئامرازی گشتین بۆ پێکهێنان .

فەلسەفە بە پرسیارەوە بەندە، فەلسەفە نابەخشآ، بەڵکو دادەهێنآ، دەبێ دابهێنآ، پێکناهێنآ، بەڵکو بۆ خۆی تێزێکی خودییە.. وەک دەزانین داهێنان و تێزی خودی وەک یەک دەکەونەوە. هەموو داهێنانێک بۆ خۆی وەک پێویست تێزێکی خودییە. کاتێک وەک بەهایەکی مەعریفی پرسیار تەجاوز دەکەین، دەگەینە بازنەیەک کە یەکلاکردنەوەی قورس دەکەوێتەوە، ئەویش پەیوەندی جەستە و پرسیارکردن و پەیوەندی فەلسەفەیە بەو نوێنەرایەتیکردنانەوە. جەستە بە پرسیارەوە دادەمەزرآ، وەک چۆن لە هەمان کاتتدا هەڵگری پرسیارە و کۆی ڕووداوەکان لە ڕێگای پرسیارەوە لەخۆ دەگرێت. کەواتە پرسیار جەستەیەکی ونە و جەستە پرسیارێکە پێویستی بەدیاریکردن هەیە. بەمجۆرە دەشآ لە ڕێگای فەلسەفەوە بەهای سروشتی خود و جەستە بخەینە بەرچاو.

ئەگەر گۆشەگیری چڕبوونەوەی جەستە لەخۆ بگرێت، ئەوە مردن ئەو تەوەرەیە کە بەدەوری جەستەدا دەخولێتەوە. لێرە لەنێوان مردن و گۆشەگیریدا دەشآ کەشفی ئەو پرسیارانە بکەین کە تکۆڵی لە هەموو ئەو بەها و بابەتانە دەکەن، کە کۆمەڵێک مرۆڤ دەیسەپێنن.

بەیەکگەیشتنی یەکەم لە ڕێگای جەستەوەیە، ئەوە جەستەیە ساتەوەختی لەدایکبوون و مردن وەک ڕێچکەیەکی ئەنتۆلۆژی وێنە دەکات، بەڵام دەشآ بپرسین ئەو پێوەرە چییە کە دەتوانآ لەنێوان شیاوی فەلسەفی و ئەویدیکەدا دابڕان بسازێنآ؟ لەبەر ئەوەی هەموو مرۆڤێک دەکەوێتە ژێر هەمان دەسەڵاتی بایۆلۆژییەوە. ئیتر جیاوازییە کردە فەلسەفییەکان و ئەوانیدیکەی کردە فیزیکیەکان، لە بنەڕەتدا لە سروشتی بۆشاییەوە هەڵدەقوڵێن، بۆشاییەک کە جەستە لەگەڵ خۆ دەبات، بەڵام نەک وەک بارستەیەکی ماددی کە کۆمەڵێک خەسڵەتی ماددی لەخۆدا هەڵگرتووە، بەڵکو وەک سروشتی تەوزیفکردنێکی نوێی بایۆلۆژی، وەک بوونێکی خودییانە، ئەوەش هەر تەنها مەسەلەیەکی ئاگاییانەی بوونگەرا نییە، یان هوشیارییەک کە لەنێوان هەستەکانەوە بلەرێتەوە، چونکە بوونی خود تەواوی ئەوانە تەجاوز دەکات، بەڵکو ئەوە مەسەلەی هەڵوێست و چارەنووسە، نەک هەر هێندە بەڵکو دابڕانێکی گەورەیە لەگەڵ بوون (لەدایکبوونی بایۆلۆژی). هیچ فەلسەفەیەک بەبێ جەستە نییە، بەتایبەتی جەستەیەک، کە لە فەلسەفە ڕادەکات .

فەلسەفە لە ڕێگای دووبارە دروستکردنی پەیوەندی ئەنتۆلۆژی نێوان جەستەو پرسیارەوە دەشآ گرفتەکان چارەسەر بکات، بەو مانایەش خەسڵەتی مردن لە بیرکردنەوەی نافەلسەفیدا بەجۆرێک لە جۆرەکان بەندە بە کۆمەڵێک کۆنتێکستەوە (سیاق (context-کۆمەڵێک کۆنتێکست کە لە خودی خۆیان جیاوازن، کۆمەڵێک کۆنتێکست کە بەهایەکی فرە و جیاواز بە چەمکی ناسنامە دەبەخشن. کەواتە پرسی جەستە پرسێکە دەکەوێتە دووتوێی لۆژیکی گومانی فەلسەفییەوە، لەسەر تەجاوزکردنی بەردەوامی دامەزراو و چەسپاو خۆی دەنووسێتەوە، هەموو شیانەکانی خۆی لە مردندا کەشف دەکات، بەڵام وەک داهێنان و خەلقکردن.

مردن کۆتایی نییە، وەک چۆن دابڕان نییە لەگەڵ بوون، بەڵکو کۆنتێکستی خودە و لە ڕێگای خۆیەوە کۆمەڵێک چەمک بە زەمان و مەکان دەبەخشێت و خۆی لە وێناکردنی فیزیاییانە جیا دەکاتەوە و وا دەکات ئەوانیدیکەی جیاواز بەڵگەیەکی ڕێژەیی بن بۆ بوونێکی هەڵە. مردن دەلالەتی خۆی بە فرەیی ڕەها دەبەخشآ. مەرگی فەلسەفە تێزی مەرگی بیۆلۆژی بەهێزتر دەکات، بەپێچەوانەشەوە پرسی فەلسەفە مەرگ وەک میکانیزمێک بۆ بوون دەخاتەوە.

سێوی مەعریفە.
بازنە داخراو/کراوەکانی جەستە.

"جەستە، تیشکۆی مەعریفە و کانی ژیانە"

جەستە لە فیکری هاوچەرخدا بە یەکێک لە وەسیلە بنەڕەتییەکانی تەعبیرکردنی خود دادەنرێت. بەو مانایەش مرۆڤ لە رێگای جەستەوە لە ئەویدیکە دەگات، وەک چۆن هەر لە رێگای جەستەوە دەرک بە شتەکان دەکات. جەستە هەر تەنها قالب، یان تەن نییە، بەڵکو لە هەمانکاتدا خودە و ئامرازی (من)ە بۆ چەسپاندنی خودی خۆی و وێناکردنەکانی خۆی لە دەرەوە، وەک چۆن بۆ ئەوەی بتوانآ ڕووبەڕووی شێوە جیاوازەکان بێتەوە، بە گۆڕینی مەرجەکانی واقیع و ناوکۆییەکانی خۆی هەڵدەسێت. لێرەوەیە دەربڕینی جەستەی مرۆ بە ڕەفتاری خودی ئەو جەستە و وەزیفەکانی و جولەکانییەوە پەیوەست دەبێت! بەو مانایەش جەستە لەنێوان خۆی و ڕەگەز و زمان پەیوەستبوونێک بەخۆی دادەمەزرێنآ. کەواتە جەستە نیشتمان و شوێنی لەدایکبوونی خۆیەتی، وەک چۆن ئامرازی ئەو دەلالەتانەیە کە خود لە رێگایەوە لە خودی خۆی دەردەچێت و دەکەوێتە نێو دنیایەک لە خۆی و بۆ بوونی تایبەتی خۆی دەبێتە کۆمەڵێک پەیوەندی و ڕەمز، هەر لەوێشەوە دەبێتە ڕەگەزێکی سەرەکی پێکهێنانی فەلسەفەی فینۆمینۆلۆژیا.

)مۆریس میرلۆپۆنتی Merleau-Ponty ١٩٠٨-١٩٦١ ( پێیوایە مرۆڤ لە رێگای جەستەوە بوونی خۆی لە جیهان ڕادەگەیەنێت. جەستە ئامرازێکە بۆ ئامادەگی لە جیهان و بوون بە بەشێک لە واقیع. هەروەها دەڵێ جەستەی من لەبەرانبەرم نییە، ڕووبەڕووی منە، واتە بابەتێکی وەستاو بە خۆی نییە، یان شتێک نییە لە دەرەوەی من بێت و بێ من سەربەخۆ بێت، بەڵکو من جەستەی منە. لێرەدا دەرککردن ئەوە نییە کە کلاسیکیەکان و قوتابخانەی دەروونی تەقلیدی بە چالاکی فیکری و دەروونی دایدەنێن، بەڵکو دەرککردن ئەو پەیوەندییە پتەوەیە کە دەکەوێتە نێوان جەستە و ئامادەگی جەستە لە جیهاندا، نەک هەر هێندە، بەڵکو جەستە لای میرلۆپۆنتی بنەڕەتی هەموو دەرککردنێکە. جەستە دەریچەیەکە شتەکانی لێوە دەبینین. ئەو پێیوایە ئەگەر قسەکردن تەعبیر لە فیکر بکات، ئەوە جەستە تەعبیر لە جیهان دەکات. دنیا و جەستە لەنێو بینراودان، کەواتە دەبێ واز لەو حوکمانە بهێنین کە جەستە دەخەنە نێو جیهان و بینین دەخەنە نێو جەستەوە، یان بە پێچەوانەوە. چونکە هەر یەک لە جیهان و جەستە بەنێویەکداچوونە، یەک لەنێو ئەویدیکەدا دەبینرێت.  بەڵام وەک دەزانین هەر لە سێوەکەی ئادەمەوە، جەستە دەکەوێتە بەر ئازار و سزا و چەوسانەوە، لەبەر ئەوەی بە سەرچاوەی گوناح دادەنرێت؟! ئەوەی ئەو گوناحەی جەستەش پاک دەکاتەوە جگە لە سزادان، دەستبەسەراگراتن و داخرانی جەستەیە. یەکەمیان ڕیسوابوونی جەستە نیشان دەدات و دووەم قەدەغەکردن. ئەگەر ڕیسوابوونی جەستە وێرانکردنی جەستە بنوێنآ، ئەوە قەدەغەکردن بێ بەهایی جەستە وێنا دەکات. ڕیسواکردن و قەدەغەکردنی جەستە تەعبیر لە دیدێک دەکات، کە پێیوایە بەختیاری بە بەندکردن و داخستنی جەستەوە بەندە؟! ئەو دیدە پێیوایە بۆ ئەوەی مرۆڤ خزمەت بە مرۆڤایەتی بگەیەنێت، پێویستە جەستە لە رێگای ڕیسواکردن و قەدەغەکردنەوە لە خراپەکان پاک بکاتەوە؟! بەڵام لەبەرانبەر ئەو دیدە دیدێکی دیکە ڕەوایەتی بە خۆی دەدات و پێیوایە هەڵەی یەکەم جگە لە بانگەشەکردن بۆ ئازادی شتێکی دیکە نییە، پاکبوونەوەش لە گوناح جگە لە بێ بەهاکردنی جەستە، ڕیسواکردن و بەزینی جەستەش دەگەیەنێت؟! ئەو دیدە، پاکبوونەوەی جەستە لە ئازادی جەستەدا دەبینێتەوە، نەک لە قەدەغەکردن.

دیدی یەکەم بەهای مرۆڤ لە ڕیسوابوونی جەستەدا هەڵدەگرێتەوە، بەڵام دیدی دووەم هەموو بەهاکان هەڵدەوەشێنێتەوە تەنها ئەوە نەبێ کە بە جەستەوە بەندە، هەر لە پەرستنی جەستەوەش سرووتێک دەسازێنآ. دیدی یەکەم پێیوایە لەبەر ئەوەی جەستە بۆگەن دەبێ، بۆیە هەموو شتآ بێ بایەخ و بۆشە، بەڵام دیدی دووەم دەیەوآ پارێزگاری لە جەستە بکات و پێیوایە هەموو تەگەرە دروستکردنێک بۆ جەستە، تەگەرە دروستکردنە بۆ خودی ئازادی! بەو مانایەش جەستە بە پێش جەستەو پاش جەستەوە نابەستێتەوە، بەڵکو خودی جەستە بە بنەمای بەختەوەری دادەنێت. هەر لەسەر ئەو بنەمایەش دەڵێت: جەستەیەکی ئازادم بدەرآ، دەروونێکی میهرەبان وەرگرەوە، بەڵام جەستەی ڕیسوا و بەزیوو نە میهری تێدایە و نە ئازادی .

کەواتە سێوەکەی ئادەم لە داری مەعریفەوە چنراوە، خواردنی سێو، جگە لە مەعریفە و ژیان شتێکی دیکە نییە، ئەگەر مەعریفە هۆیەک بێ بۆ بەردەوامییەتی مرۆڤایەتی، ئەوە ژیان پانتاییەکە بۆ لەخۆگرتنی هەموو جولە و ڕیتمە جیاواز و گونجاوەکانی مرۆڤایەتی. بەو مانایە جەستە، ژیان و مەعریفەی لێدەکەوێتەوە؟! بۆیە پێویستە ڕێزگرتن و بە پیرۆزگرتنی وەک ئەرکێکی مرۆڤانە سەیر بکرێت.

ئەو بەهەشتەی کە ئادەم بەر لە تامکردنی مەعریفەی جەستە تێیدا دەژیا، ڕەمزی هاوسەنگی بوو. بۆیە کاتێک مرۆڤ لە بەهەشت دەرکرا بەدوای ئەو هاوسەنگییەدا وێڵ بوو، بۆ ئەوەی ئەو هاوسەنگییە دووبارە وەدەست بهێنێتەوە وێڵ بوو، بەدوای فیکرەی زۆر دوور کەوت، چونکە نەیدەزانی ڕێگای گەڕانەوە بۆ هاوسەنگی لە خودی جەستەودایە.. ئەوە خودی جەستەیە هاوسەنگی دەسازێنێ! ئیتر لێرەوە دەبینین هاوگونجانی فیکر و جەستە تەعبیر لە هاوسەنگی ژیان دەکات و بێ ئەو هاوسەنگییە ناتوانین بەرگەی ژیان بگرین، بۆیە جەستە، بە تیشکۆی مەعریفە و کانی ژیان ناس دەکرێت. ئەگەرچی بیروڕای جیاواز لەبارەی داخران و پەردەپۆشکردنی ئەندامە سێکسییەکانی جەستە لە ئارادا هەیە، بەڵام (فرۆید، سیگمۆند) Freud Sigmund ١٨٥٦-١٩٣٩ (داپۆشینی ئەندامە سێکسییەکان بە پیرۆزییەوە دەلکێنێ، بەڵام دەشێ ئەو داپۆشینە بە پیسییەوەش بەند بکەین. وەک چۆن دەشێ هەردوو هۆکار وەک هۆیەک بۆ داپۆشین تەماشا بکەین.

لێرە لەنێوان پیسی و پاکژی، لەنێوان هەڵەی یەکەم و سزادان، لەنێوان کۆت و بەند و ئازادی، سێوەکەی ئادەم لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکانەوە بۆ ئەفسانەو ئایین و تا دەگاتە تراژیاکانی گریک درێژبۆتەوە و گەمەی جۆراو جۆری لەبەرانبەردا دەکرێت. چەمکی سێوەکەی ئادەم بە دیدێکی میتافیزیکییەوە بەندە، هەر لەو دیدەشەوە سێوەکەی ئادەم بە ڕەمزی کەوتن وەسف دەکەن؟! سێوی ئادەم هۆی دەرکردنی ئادەم و حەوا. لە سێوی ئادەمەوە، ئادەم و حەوا ژیانی هەتا هەتایی بەهەشتیان دۆڕاند، سێوی ئادەم لەبەرانبەر ڕۆح دەبێتە ئەهریمەنی فاوست و مەعریفە پێشکەش دەکات! ئەوەی کە دەگوترێ ئادەم بەختەوەری نەمری دۆڕاند، دەشێ لەوێوە کورتی بێنێ کە بنبەستبوونی نەزانیش دەدۆڕێنێ!! لێرەوە فیکرەی دووەم ئازادی بەرز دەکاتەوە و مەعریفە وەک بنەمای پێشکەوتن تەماشا دەکات.

لەنێوان سێو و کەوتن، لەنێوان کەوتن و نەفرەت، نەفەرەتی هەتا هەتایە، مرۆڤ هەموو ڕۆژێ سێو دەکرمێنێ! سوپاسگوزاری و پیاهەڵدان.. پاکبوونەوە دابین ناکات. کورسی دانپیانان، ئەو تاوانە ناسڕێتەوە! بۆیە مرۆڤ دووچاری نائومێدی دەبێت. هەڵەی یەکەم ئەوەی مرۆڤ دەبێ باجەکەی بدات، هەڵەی جەستەیە نەک هیچ هەڵەیەکی دیکە. بۆیە کۆمەڵگا سەرەتاییەکان، ئایینەکان، نۆرم و ترادیسیۆنەکان، پاکبوونەوە بەسەر جەستەدا فەرز دەکەن، تا مرۆڤ نوێ بێتەوە؟! بەڵام جەستە لەناو دەچێت، بێگومان نیگەرانی مردن وەک مەسەلەیەکی فەردی سەیر دەکرێت، هەر دەبێ لەگەڵی بسازێ و بەدوای چارەی گونجاودا بگرێت؟ !

ئۆدیب پاشا چاوی خۆی بەهۆی سێوەکەی ئادەمەوە لە دەستدا، ئەو کەشیشەی کە لە تاقیکردنەوەیەکی خەونئامێزدا بیر لە سێوەکەی ئادەم دەکاتەوە، چۆن ئیمان لە دەستدەدا... لێرەوە لە هەموو ئەو نموونانە بۆمان دەردەکەوێ چۆن هەڵە و گوناح دوای سوپاسگوزاری بەرەو پیرۆزی دەچێ و چۆن پیرۆزییەکان بە تەنها بیرکردنەوە لە سێوی ئادەم وێران دەبن.

کەواتە کوێ ئەو کارەسات و تراژیدیایانەی بەسەر مرۆڤایەتیدا هاتووە، کوێ هەڵە و پاکبوونەوەکان... هەموو ڕزگاربوونێک لە سێوەکەی ئادەم، پێویستی بە ئازار و سزا و مەرگەوە هەیە، یان دانپیانان و تۆبە و پەشیمانبوونەوە... بەو مانایانەش هەموو ئەفسانەکان و ئایینەکان و ترادیسیۆنە سەرەتاییەکان، مرۆڤ وەک وامدارێک سەیر دەکەن، کە هەوڵدەدات بەڵگە بۆ تاوانەکانی خۆی بهێنێتەوە، بەڵام لێرە چۆن دەشێ ڕوویەکی دیکەی ئەو تێڕوانینانە وێنا بکەین، چۆن دەشێ خوێندنەوەیەکی دیکەیان بۆ بەئەنجام بگەیەنین. لە کوێ ئەو کارەسات و تراژیدیایە، چۆن کوێ ئەو بەتاوانبارکردن و ڕیسوایی و بێ نرخکردنانە، کوێ گوناحەکان وەک بەخشندەیی و ناز و خۆشی و چاکەکردن بخوێنینەوە!! چۆن لەگەڵ جەستە، لەگەڵ سێوەکەی ئادەم ئاشت ببینەوە؟! لەبری ئەوەی مرۆڤ بخەینە نێو ئازار و سزا و ژانوژوار... دەشێ دلشاد و بەختەوەری بکەین.. دەشێ سێوەکەی ئادەم وەک چاکەکاری و بەخشندەیی و ڕێگایەک بۆ پاراستنی مرۆڤایەتی، وەک وەسیلەیەک بۆ گەیشتن بە مرۆڤی حەقیقی سەیر بکەین؟! هەر لەوێشەوە دەشێ سێوەکەی ئادەم وەک سرووتێک بۆ بە پیرۆزڕاگرتنی جەستە و ڕێزگرتنی جەستە تەماشا بکەین؟! واتە دەشێ کوێ ئەو تەماشاکردنە سەرەتاییانەیە بە بەخشندەیی و ناز و خۆشی بگۆڕینەوە. جەستە وەک ژیان ببینین و ژیانیش لە مەعریفە و ڕۆحدا درێژ بکەینەوە.

جەستە، بە کوێ دەگات؟ لەپاش فەلسەفەی جەستە چی وەستاوە؟ وەک دەزانین هەرگیز کەسێتی مرۆڤ ئەو کەسێتییە هاوگونجاوە نییە، کە لەگەڵ خودی مرۆڤ تەبا بێتەوە، بەڵکو کەسێتی مرۆڤ بارستاییەکە لەنێودژی و خاوەنەکەی

هەمیشە هەوڵی بەیەکگەیشتنی ئەو نێودژیانە دەدات. هەندێکجار کەسێتی بە دژی خۆی ڕادەبێتەوە و لاملی دەکات و سوورە لەسەر ناتەبایی، بەڵام مەرج نییە ئەو نەگونجان و ناتەباییە لە نائاگاییەوە بێت، بەڵکو لە زۆربەی جاردا بە ئاگاییەوە بە ئەنجامی دەگەیەنرێت. بۆ نموونە زۆرجار پەندیارێک، بانگەشەی بۆشی جەستە دەکات.. کەچی لە ناخەوە بێ سنوور بایەخ بە جەستەی خۆی دەدات! یان سەیر دەکەین یەکێک لە ڕووکاردا زۆر دڵخۆش خۆی دەنوێنی، بەڵام کە دەچیتە ناخی دەبینی چەند غەمبارە... بە کورتی لەپشت ئەو ناهاوسەنگییەی ناوەوەی جەستە مەرگ وەستاوە، وەک چۆن فەلسەفەی جەستە لە مەرگدا خۆی دەدۆزێتەوە! ئەو هەموو بایەخدانە بە جەستە، ترسی مەرگی لە پشتەوەیە. کەواتە بۆ ئەوەی بە فەلسەفەی جەستە بگەین، دەبێ فەلسەفەی ئازادی جەستە ڕابەرایەتیمان بکات. بۆ ئەوەی بە ئازادی جەستە بگەین، پێویستمان بە هاوسەنگی نێوان جەستە و ئاگایی هەیە. هەموو هاوسەنگییەکی نێوان جەستە و ئاگایی، دەلالەتی ئارامی و دڵنیایی و هێمنی جەستە دەنوێنآ. هەر لە ڕێگای ئارامی و هێمنی و دڵنیایشەوە جەستە دەتوانآ پێشبینی بکات. واتە لە ڕێگای هەستی ڕاستگۆیانەی جەستەوە فیکر دەتوانآ ئاگایی بدۆزێتەوە، هەر بەو مانایەشەوە فیکر جەستەیی دەکەوێتەوە. کەواتە فیکر بەبێ جەستە هەرگیز ناتوانآ بە ئەرکەکانی خۆی ڕابێتەوە. ئەگەر بێتو جەستە فەرامۆش بکەین، ئەوە بێگومان عەقڵ و ئاگایشمان فەرامۆش کردووە. دواجار هەر لە ڕێگای جەستەوە، دەشآ دەست بۆ ئاڕاستەکانی بەختیاری درێژ بکەین.

لە سەدەی ڕینیسانس و سەد ساڵی یەکەمیدا جەستەی ڕووت دەکەوێتە نێو هونەرەوە، ئەوەش بۆ خۆی کرانەوەیەکی دیکە بوو، بۆ ڕاڤەکردن و شیکردنەوەی نۆرم و ترادیسیۆنە کۆنەکانی چاخی ناوەڕاست، چونکە ئەو کات قسەیەکی جیدی لەسەر جەستە بوونی نەبوو. بەڵام دواتر لە ڕێگای هونەرەوە، نەبینراو و نادیارەکانی جەستەمان بۆ دەرکەوت، بۆ نموونە: (تابلۆی لە خاچدانی مەسیح، مایکل ئەنجیلۆ)... بەڵام جەستەی ڕووت هەر تەنها لە چوارچێوەی هونەردا نەمایەوە، بەڵکو هەر لە ڕێگای ئەو ڕووتبوونەوەیە دەرکەوت، کە جەستەی مرۆڤ زیاد لە پێویست شێوەیەکی جوان و تەواوی لەخۆ گرتووە، بەو مانایەش جەستەی ڕووت مەزنترین نموونەی گۆڕینی مادەیە بۆ شێوە؟! کەواتە هەرگیز ناشآ جارێکی دیکە نکۆڵی لە جەستە بکەین، وەک چۆن لە چاخی ناوەڕاست ئاییینگەراییانی مەسیحی نکۆڵیان لێدەکرد. بەمجۆرە وەک حەقیقەتێک کە بە درێژایی ژیان خاوەنداریتیمان دەکات، لەگەڵ جەستە ئاشتبوونەوەمان ڕاگەیاند.

بێگومان مێژووی مرۆڤایەتی لە گەڕان بەدوای نادیار بەردەوامە، مێژووی مرۆڤایەتی مێژووی گەڕانە بەدوای نەبینراو نادیار، مێژووی دۆزینەوە و داهێنان و بەخشینی جۆراوجۆرە. مرۆڤایەتی هەر لە سەرەتای بوونەوە هەتا ئێستا بەردەوام هەوڵدەدا دەرگا لە نادیارەکان بکاتەوە، نادیاری سروشت، نادیاری کۆمەڵگا، نادیاری بوون و گەردوون... سەفەری گلگامێش بەدوای نهێنی ژیاندا.. گەڕانی زاناکان بەدوای مادەیەک کە شت بکاتە زێڕ.. یان مادەیەک کە هەڵوەشانەوەی جەستە ڕابگرآ و مردن دوور بخاتەوە...، بەڵام وێڕای ئەو هەموو دۆزینەوە و داهێنانە جۆراوجۆرانە کەچی نادیارەکان ئەوەندە زۆرن کە دیار لە چاو نادیار لە دورگەیەکی بچووک زێتر نییە. بۆ نموونە چۆن نەهەنگی (عەنبەر) دوژمنەکەی دەناسێتەوە، کام ئەندامی جەستە بەو کارە هەڵدەستێت؟ باڵندەکان چۆن دوای سەفەرگەلی دوورودرێژ، دوای بڕینی ئەو هەموو چیا و دەریا و دار و دەشتە.. بە لانەکانی خۆیان شاد دەبنەوە؟ گژوگیا چۆن هەست بە دوژمنەکەی دەکات و چۆن دژی دوژمنەکانیان دەجەنگن و دوژمنەکەیان دەخەنە تۆڕەوە؟

هەمیشە مەعریفەی جەستە دەلالەتی دووبارەبوونی لەخۆدا هەڵگرتووە، بۆیە پێویستە لەپاڵ ئەو هەموو نادیارانەوە مرۆڤ بەردەوام هەوڵی هاوگونجان بدات، بەردەوام ئاگایی و جەستە بە ئەرکی سەرەکی خۆی بزانآ...، چونکە جەستە بۆ خۆی ڕێگایەکە بۆ گەڕانەوە. بۆ نموونە: ئەگەر سەیری ئەفسانەی (ئەدۆنیس) بکەین، دەبینین سروشت تەنها بە مەرگی جەستەی ئەدۆنیس لەناو دەچآ و پەژموردە دەبێت. لێرەدا ئەدۆنیس دەبێتە ڕۆحی سروشت. واتە ژیانی جەستەی ئەدۆنیس-لە کۆتاییدا- مەرگی ڕۆحی زیندووی سروشت دەگەیەنێت. ئەدۆنیس لە دوای کوشتنی دەبێتە (هادیس- واتە ماڵی مردووان) هەتا ئەدۆنیس لەو ماڵەدا بمێنێتەوە، سروشت بە مردووی دەمێنێتەوە، کاتآ جەستەش لەنێوان مردووان هەڵدەسێتەوە، دووبارە ژیان لە سروشتدا دەبوژێتەوە. لە دووتوێی ئەو ئەفسانەیە دەبینین ڕۆح لە دوا لێکدانەوە تەنها ڕەمزی چالاکی جەستەیە. تا ماوەیەک ڕۆح جەستە بەجێدەهێڵآ و پاشان بۆی دەگەڕێتەوە!

**سێوی مەعریفە.**
**لەنێوان یەکسانی و جیاوازی.**

**"لە دیدی من ئافرەت تێکەڵەیەکە لە شێوە و ڕەنگ "**
**(بیکاسۆ)**

**ئەگەر سێو ڕەمزی ژیان و مەعریفە بێ، لەوێوە دەلالەتەکانی ژیان لەخۆ بگرآ کە لە ڕێگای جەستەوە مەعریفە بەدەست دەهێنآ، ئەگەر سێو تەعبیر لە جەستە بکات، لەوێوە کە ڕەمزی خۆشەویستییە، ئەوە دەشآ بڵێین مرۆڤ لە ڕێگای جەستەوە بوونی خۆی لە جیهان ڕادەگەیەنێت، لە ڕێگای جەستەوە بە مەعریفە دەگات، لە ڕێگای جەستەوە پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەویدیکەی دروست دەکاتەوە... کەواتە جەستە هەر تەنها ئامرازێک نییە بۆ ناسین، بەڵکو ئامرازێکە لە ڕێگایەوە مەعریفە ناس دەکەین، ئامرازێکە بۆ ئامادەگی لە جیهان و بوون بە بەشێک لە واقیع.. لێرەدا ئەوەی (مۆریس میرلۆپۆنتی) و فینۆمینۆلۆژییەکان دەیخەنە ڕوو هەر تەنها پرسێکی بوونگەرایی نییە، بەڵکو پرسگەلێَکە تەواوی ژیان لەخۆ دەگرێت، هەر لە ڕێگای ژیانیشەوە دەشآ جەستە وەک سێوی مەعریفە ناس بکەین.**
**لێرەدا قسە لە ئازادکردنی جەستە و ڕیسوابوونی جەستە بە مانا گشتییەکەی ناکەین، بەڵکو هەوڵدەدەین لەنێوان ڕەگەزی نێر و مآ، جەستە بخوێنینەوە. ئەو خوێندنەوەیەش ڕاستەوخۆ بە ڕەهەندە جیاواز و یەکسانەکانی جەستەوە بەند دەکەین، بەو مانایەش هەوڵدەدەین سێوی مەعریفە وەک ناسنامەی جیاوازی و یەکسانی بخوێنینەوە. ئاشکرایە نێرایەتی و مێیایەتی دوو ڕووی جەوهەری بوونی مرۆیی لەخۆ دەگرن، هەر یەکەیان تایبەتمەندی و خەسڵەت و ڕۆڵی خۆی هەیە، بە هەردووکیشیان تەواوی لایەنەکانی ژیاری مرۆڤایەتی پێکدەهێنن.**

**پێناسەی فێمینیزم.**

**کۆیلایەتی، ملکەچکردن، پەسەندکردن، جنێو، ڕاهاتن لەگەڵ گریان و درۆزنی، نەبوونی بانگەشە، خۆپێشکێشکردنء... هتد، تەواوی ئەو ڕەفتار و ڕاوەستانەی ئەخلاقی ئازادی پەسەندیان ناکات، بە پیشەی ئافرەت دەناسرێتەوە. لەو لایەنەوە ژن زەمینەیەکی کۆمەڵایەتی ڕوخێنراوە، زەمینەی ڕاستەقینەی کۆیلایەتییە، کۆنترین زەمینەی دەزگاییە کە تەواوی کۆیلایەتی و ڕەفتارە بێ ئەخلاقییەکان لەسەر ئەو دەست بەکار دەبن.. لەو سۆنگەیەوە بە درێژایی مێژوو هیچ کۆیلایەتییەک هێندەی کۆیلایەتی ژن هەرس نەکراوە و ڕەوایەتی پێنەدراوە و درێژەی بەخۆی نەداوە. هەڵبەتە ئافرەت وەک کۆیلە و ئافرەت وەک بوونەوەرێکی ڕوخێنراو، یان بە مانایەکی دیکە پێکهاتەی ژن لە کۆمەڵگادا دوو جۆر کاریگەری وێرانکەرانەی هەیە، یەکەمیان: کرانەوەی کۆمەڵگایە بە ڕووی کۆیلایەتیدا. دووەمیان: بەڕێوەبردنی تەواوی کۆیلەکان، یان کۆیلایەتییەکانە لەسەر بنەمای بە ژن کردنیان. لەو خاڵەوەیە (هیتلەر) کۆمەڵگا وەکو ژن دەبینآ کە ئەسپی (دەوڵەت- نەتەوە) لێی سوار دەبێت .**
**بەکورتی هەر لە ئەفلاتون و ئەرستۆوە تا هۆبز و ڕۆسۆ، جیاوازی دەخەنە نێوان ژنان و پیاوانەوە.. بیرکردنەوەی فیودالی نێرینە بە نوێنەرێکردنی دەسەڵاتی سیاسی دادەنآ، بیرکردنەوەی کۆماریخوازی ئافرەت لە مافی دەنگدان بێبەش دەکات، بیرکردنەوەی دیموکراسی لە مافی هاوڵاتیبوونیان دەکات. کەواتە وەک دیارە مێژووی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هەڵگری بنەمایەکی دیار و شاراوەی نێرسالارییە، ئەوەش بە پشتبەستن بە ویل دورانت کە دەڵێ: سوود وەرگرتن لە وشەی "پیاوان" بۆ دیاریکردنی تەواوی جۆری بەشەر بریتییە لە دەمارگرژی سەردەمی باوکسالاری. بەڵام ئەگەر ئەمڕۆ زاراوەی پیاوسالاری وەک کێشەیەکی خێزانی چاو لێبکەین، ئەگەر یاسا و سیاسەتە گشتییەکان بە شێوەیەکی یەکسان لەگەڵ ژنان و پیاوان وەک یەک مامەڵە بکەن، ئەگەر مافە مەدەنی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بۆ نێر و مآ وەک یەک بکەوێتەوە، ئەوە دەتوانین بەسەر پیاوسالاریدا زاڵ بین .**

لێرە لەو بە پەراوێزکردنانەدا، ژنگەراریی سەریهەڵدا. کەواتە ژنگەرایی یان فێمینیزم (Feminism) دەشآ هەموو ئەو کۆششە تیۆری و پراکتیکییە بگرێتەوە، کە ئامانجی خۆی لە چاوپێداخشانەوە و وەڵامدانەوە، یان ڕەخنەگرتن و چاککاری بنەما کۆمەڵایەتییەکانی سیستمی باودا هەڵدەگرێتەوە، ئوز سیستمەی کە پیاو بە سێنتەر دادەنآ و ئافرەت بە ڕەگەزی دووەم یان ئەویدیکە نزمتر لە پیاو لە قەڵەم دەدات. یان بە مانایەکی دیکە ئافرەتگەرایی کۆمەڵە تیۆرێکی کۆمەڵایەتی جۆراوجۆری بزاڤی سیاسی و فەلسەفی و ئەخلاقی دەگرێتەوە کە پەیوەستن بە مەسەلەی ئافرەتانەوە، دوا ئامانجیان بنبڕکردنی فۆرمەکانی دەستبەسەراگرتنی ڕەگەزی مێیە، بۆ ئەوەی بتوانن لەگەڵ پیاوان بە ئازادی بەشداری لەبەرەوپێشبردنی کۆمەڵگا و بەرەوپێشبردنی ژیاندا بکەن .

بزاڤی ئافرەتان لە فیکری خۆرئاوادا لە سەدەی نۆزدەوە لە ڕێگای زاراوەی فێمینیزمەوە فۆڕمەلە کراوە و بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٨٩٥ ئەو زاراوەیە تەعبیری لە شەپۆلێک دەکرد کە کۆمەڵێک ڕێبازی لەخۆ دەگرت و چەندین لقی لێجیا دەبۆوە. نیازی سەرەکی ئەو بزاڤە بەدەستهێنانی مافگەلێک بوو، کە پیاوان بە خۆیان ڕەوا دەبینی، بەڵام ئافرەتانیان لێ بێبەش کردبوو، ئەو بزاڤە بۆ وەدەستهێنانی ئەو مافانە جەختیان لەسەر یەکسانی نێوان ژنان و پیاوان دەکردەوە، بەڵام شەپۆلی دووەمی ئەو بزاڤە فێمینیزمییە لە شەستەکان و بە تایبەت لە ئەمریکا بەدەرکەوت و بە پرنسیبە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانەوە بەند بوو. ئەو بزاڤە ئەمریکییە کە بە (فێمینیزمی نوآ ) ناونرابوو، لە ڕووی فیکرییەوە پێگەییوو بوو، هەوڵی دەدا لە ڕووی تیۆرییەوە قووڵتر و بەرفرەوانتر خۆی بنوێنآ و هەر تەنها لە داوای یەکسانی نێوان پیاوان و ژناندا خۆی قەتیس نەکات، بەڵکو کەشفکردنی دووبارەی ژنبوونی لە ڕێگای ژنەوە بە هەند هەڵدەگرت و دواتر ناسنامەی ژنایەتی، واتە فێمینیزمی لە ڕێگای تیۆرەوە فۆمەلە کرد و توانی بەهۆی گەشەی مەعریفییەوە کۆمەڵێک گۆڕانکاری بەدەستبهێنآ و کۆمەڵێک توێژینەوەی ئەکادیمی بەرز لەو بارەوە بخاتە ڕوو. لە پشت ئەو شەپۆلە گەورەترین دایکی فەلسەفەی ژنایەتی هاوچەرخ بە کتێبی (ڕەگەزی دووەم ١٩٤٥) هاتە قسە، ئەو نووسەرەش (سیمون دوبۆڤوار١٩٠٨-١٩٨٦) بوو، کە گووتی "مرۆڤ وەک ژن لەدایک نابێت، بەڵکو بۆ ژن دەگۆڕێت. بێگومان فێمینیزم لەوێوە لە فەلسەفەی بوونگەرایی جیا دەبێتەوە کە هەر تەنها بایەخ بە شارەزایی زیندووی هاوژیانی خودی فەرد نادات، بەڵکو بایەخ بە تیۆرگەلی گەورە دەدات، کە ڕۆژ دوای ڕۆژ لەبەرفرەوان بوون و قووڵبوونی لقە مەعریفییەکانیدا خۆی دەبینێتەوە. ئەوەی کە شەپۆلی فێمینیزمی نوآ جیا دەکاتەوە ئیشکردنە لەسەر پارادیمی عەقڵانیەتی نێرسالاری مرۆڤ، وەک سێنتەری ژیاری خۆرئاوایی، کە دەشآ ماوەی کۆلۆنیاڵی وەک نموونەیەکی هاوچەرخ و گشتگیری ئەو عەقڵانییەتە نێرسالارییە تەماشا بکەین. هەڵبەتە ئەو شەپۆلە لەگەڵ شەپۆلی یەکەم جیاواز و هاودژ دەکەونەوە لە جەختکردنیان لەسەر جیاوازی ژن و پیاو و کار. هەر لەوێشەوە وەک کەشفکەر و گەڵاڵەکەری ژنایەتی خۆی نیشان دەدات.

لێرەدا من نەمویستووە قسە لە پرسی فێمنیزم چییە بکەم، چونکە لە کتێبی (فێمینیزم) کە (جیەن فریدمەن) نووسیویەتی و (فەرشید شەریفی) لە فارسییەوە کردوویە بە کوردی، زۆر بە جوانی ئەو باسە خراوەتە ڕوو، لەوآ دەردەکەوآ کە فێمینیزم بە تەنها چەمکێک نییە، بەڵکو لە کۆمەڵێک بیروڕا و کردەی جۆراوجۆر و فرە ڕەهەند پێکهاتووە، هەر چەندە هەوڵی زۆر دراوە وەڵامی پرسی فێمینیزم چییە لە ڕێگای کۆمەڵێک دید و بۆچوون بدرێتەوە، کە تەواوی دیدە فیمینیستەکان لەخۆ بگرێت، بەڵام ئەو کارە بۆتە کارێکی ئەستەم، چونکە فینیمیزم زۆر جۆری جیاواز لەخۆ دەگرێت، سەرەڕای جیاوازییان هەندێکجاریش بە تەواوی دژ بەیەک دەکەونەوە. بۆیە ناتوانین بڵێین فێمینیزم چییە، بەڵام دەتوانین جەخت لەوە بکەین کە هۆی سەرهەڵدانی بزاڤی فێمینیزم بۆ بارودۆخی نالەباری ئافرەتان لە کۆمەڵگاکان دەگەڕێتەوە .

کەواتە دەشآ فێمینیزم بەپێی ڕێبازە تیۆرییە جۆراوجۆرەکان پۆلینبەندی بکەین، یەکێک لە گرنگترین ئەو پۆلینبەندییانە فێمینیزمی لیبرالی و مارکسی و ڕادیکاڵییە، بەڵام جگە لەو پۆلینبەندییە توێژینەوە تازەکان فێمینیزمی دەروونشیکاری، پۆستمۆدێرن، پۆستبونیادگەری، ڕەش، هەندآ شتی دیکەشیان پێوە زیاد کردووە .

جیاوازی لەنێوان ستایش و نکۆڵیکردندا.

**لە ساڵی (١٩٤٦) واتە بەر لە ڕاگەیاندنی پەیماننامە نێو دەوڵەتی مافی مرۆڤ بە دوو ساڵ لیژنەی ناوەندی بۆ بەرگریکردن لە ئافرەتان دامەزرا و دواتر چەندین دەستە و لیژنە و کۆمەڵە و ناوەندی دیکە لە سەرانسەری جیهان بۆ بەرگریکردن لە مافەکانی ژنان هاتە ئاراوە. لە ساڵی (١٩٥٢) کۆمەڵەی گشتی وڵاتە یەکگرتووەکان لە هاوڕاییەکدا بڕیارییان لەسەر مافی سیاسی ئافرەتان ڕاگەیاند، لە ساڵی (١٩٦٧) بانگەشەی لەناوبردنی هەموو جۆرە جیاکارییەک بڵاوبۆوە، لە ساڵی (١٩٩٣) ڕاگرتنی توندوتیژی دژ بە ئافرەتان بڕیاری لەسەر درا، ساڵی (١٩٩٥) لە کۆنگرەی لوتکەی زەوی کە تایبەت بوو بە ئافرەتان لە (پەکین) وشەی جێندەر لە بەیانی کۆتایی کۆنگرەدا (٢٥٤) جار بەکارهێنرا، وەک چۆن هەر لەو کۆنگرەیەدا قسەیان لەسەر ڕەتکردنەوەی وشەی هاوسەرگیری داو لە جێگەی ئەو، وشەی (کەپڵ) بە مانای دووانیی، یان پێکەوەژیان بەرز کردەوە... ئەگەرچی مەبەستم نییە تەواوی ئەو کۆنگرە و بڕیارانە بخەمە ڕوو کە لە پێناو مافەکانی ژنان خراوەتە ڕوو، بەڵام دەمەوێ بڵێم ئەگەرچی کێشەی ئافرەتان هەنگاوێکی باشی لە بەرەوپێشچوونی جیاکارینەکردن و یەکسانی و مافی سیاسی و مافی هاوڵاتیبوون و بارودۆخی ئابوری و ڕاگرتنی توندوتیژی ناوە، کەچی هێشتا کۆمەڵێک ئیشکالییەتی جۆراوجۆری دیکە ماوە و نەیتوانییوە چارەسەرییان بۆ بدۆزێتەوە! وەک دەزانین بزوتنەوە فێمینیزمەکان وەک یەک تەماشای ئەو کێشانە ناکەن و لە کۆمەڵێک پرنسیپ و درووشم و بنەما.. نەک هەر جیاوازن، بەڵکو دژ بەیەک دەکەونەوە. ئەوەی لە کۆی ئەو کێشانەوە دەمەوێ قسەی لێبکەم مافی ئازادی سێکسی و سێکسکردن لەگەڵ مەحرەمەکان نییە، وەک چۆن هەوڵیش نادەم لەمیانی سڕینەوەی جیاکارییەکانی دژ بە ژنان قسە لە هۆمۆسیکواڵەکان بکەم؟! هەروەها پێمولیە تاکگەرایی ئافرەتان (واتە تەماشاکردنی ئافرەت وەک تاک لە دەرەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، دایک، خوشک، ژن، کچ...) یەکێکە لە مافەکان، بەڵام دەشێ کۆمەڵێک ئیشکالی سۆزگەرایی لە خۆدا کۆبکاتەوە!**

**بەکورتی ئەوەی دەمەوێ ئاماژەی بۆ بکەم باسێکی یەکجار ئاڵۆز و دژوارە، ئەویش دوالیزمی یەکسانی و جیاوازییە! هەندێ لە فێمینیزمەکان لەوێوە بەرگری لە یەکسانی نێوان پیاوان و ژنان دەکەن، کە جیاوازی وەک هۆیەک بۆ تەماشاکردنی ژنان بە پلە دوو دەدەنە قەڵەم!، بەڵام هەندێکی دیکە لەوێوە بەرگری لە جیاوازی دەکەن، کە دەکەوێتە نێو تایبەتمەندییەکانەوە بۆیە بە پێویستی دەزانن بیپارێزن! بەڵام لەبەر ئەوەی ماناکانی یەکسانی و جیاوازی قسەوباسی زۆر دەوروژێنێ، بۆیە ڕێگای سێیەم، وەک هاوگونجانێ خۆی ڕاست دەکاتەوە، بە مانایەکی دیکە هەندێ لە فێمینیزمەکان لەو باوەڕەدان، کە دابەشکردن بەسەر یەکسانی و جیاوازی، دابەشکردنێکە سەبارەت بە بارودۆخی ئافرەتان هەر وەک خۆی ماوەتەوە، لێرەدا قسە ئەوەیە کەچی بکەن تاکو ئەو جیاوازییە نەبێتە هۆیەک بۆ سەیرکردنی ژنان لە پلەیەکی نزمتر؟**

**کەواتە یەکێک لەو نکۆڵیکردنانەی، کە ژنان ڕووبەڕووی جیاوازی دەکەنەوە، ئەوەیە، کە پیاوان پێیانوایە، کە ئافرەت بەهۆی دۆخی فیسیۆلۆژی و ڕۆڵی کۆمەڵایەتییەوە بە پلە دوو سەیر دەکرێ، واتە هەر تەنها دەتوانێ کاروباری نێو ماڵ بەڕێوە بەرێت. (شێری ئۆرتینێز (Sherry Ortenes لەو بارەوە دەڵێ: "پلە دووەهەم بوونی ژنان لە کۆمەڵگادا ڕێسایەکی گشتی جیهانییە، واقیعێکە پەیوەندی بە کەلتورەکانەوە هەیە"، بەڵام ئایا پێویستە ئافرەتان نکۆڵی لە جیاوازی ڕەگەزی بکەن، بۆ ئەوەی لە پیاوان بچن؟ (هیستێر ئیزنستاین (hester Eiesentein لە پێشەکی کتێبەکەی (ئایندەی جیاواز، ١٩٨٧) دەڵێ: "کلتوری خۆرئاوایی ئەوەی سەلماندووە،، کە ناتوانێت بیر لە "نایەکسانی" بکاتەوە، مەگەر ئەوەی بەهایەکە پۆزەتیف بە لایەنێک ببەخشێ و بەهای نێگەتیفیش بە لایەنێکی دیکە "**

**بەمجۆرە لەنێوان ئەوانەی، کە لەژێر گوشاری بایۆلۆژی و مەیلی سێکسی ستایشی جیاوازی دەکەن و ئەوانەی لە ڕێگای بە هەند هەڵنەگرتنی بایۆلۆژی و پێداگرتن لەسەر ڕێسا کلتورییەکان نکۆڵی لە جیاوازی دەکەن، گروپی سێیەم لەو بڕوایەدایە، کە ئافرەت بەڕاستی جیاوازە، ئەو جیاوازییە وای کردووە لە پیاوان باشتر بن، بۆ نموونە ئافرەت وەک بەخێوکەر ڕێکوپێکتر لە پیاوان کارەکانیان بەڕێوە بەرن، بەڵام پێویستیان بە شوناسێک هەیە، کە لە ڕێگای ڕەگەزەوە دەستنیشان نەکرێ! ئیتر لێرەوە دوالیزمی یەکسانی و جیاوازی لەمیانی چەمکی (جێندەر (Gander ڕوونتر خۆی دەنوێنێ، بەو مانایە مێینە، یان مێیایەتی سەر بە گروپێکی بایۆلۆژییە و ئافرەت سەر بەو گروپەیە، بەڵام ڕەفتار و ڕۆڵی ئافرەتان پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتییە. بە مانایەکی دیکە ڕەگەز وشەیەکە ئاماژە بە جیاوازییە بایۆلۆژییەکانی**

نێوان ژنان و پیاوان دەکات، جیاوازی ئاشکرا لە ئەندامە سێکسییەکان، لە منداڵبوون و زاوزێکردن، بەڵام "تەندروستی جیهانی" پێناسەی "جێندەر"ی بەوەکردووە، کە زاراوەیەکە بەکاردەهێنرآ بۆ وەسفی ئەو تایبەتمەندییانەی، کە پیاوان و ئافرەتان هەیانە، پەیوەندی بە جیاوازی ئەندامەکانیانەوە نییە. "رێکخراوی کاری نێودەوڵەتی" پێناسەی جێندەری لە بواری پەیوەندی و جیاوازییەکانی ژن و پیاودا لە بواری کار و وەسف کردووە، بەوپێیەی لەنێوان کۆمەڵگاکاندا ئەم مەسەلە بەپێی ئاستی رۆشنبیریی جیاوازی زۆری تێدایە و لە کۆمەڵگایە، کەوە بۆ کۆمەڵگایەکی دیکە، کار و پەیوەندی ژن و پیاو جیاوازی زۆری تێدایە، بەڵام لە یەکسانی جێندەردا ئەم جیاوازیانە بەمجۆرەی لێدێت: یەکسانی جێندەر پشت نابەستی بە رەگەز و بەرپرسیارێتی و ماف لەنێوان نێر و مێدا بەپێی ئەوەی یەکێکیان نێرە و ئەویدیکە مآ، بەڵکو یەکسانی لە دابەشکردنی بەرهەمی ئابوورییدا دەکەوێتەوە سەر دابەشکردنی یەکسانی فرسەتی کار و توانا و کاریگەریی کۆمەڵایەتی نەک نێریی و مێیی.

ئافرەت لەنێوان رۆشنبیریی نێر و ئابلۆقەی زماندا.

ئافرەت وەک سێبەرە، دوای بکەوی لێت رادەکا، لێی رابکەیت دوات دەکەوێ .
(پەندێکی ئیسپانییە)

بەدرێژایی مێژوو جنێو و ناو و ناتۆرە و قسەی سووک وەک توندوتیژییەکی زاراوەیی بە تایبەتی لە میانی ژیانی خێزانیدا و لە کۆمەڵگا دواکەوتووەکان بەرەو رووی ئافرەت، یان هەندێک جار بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەبەرانبەر خودی ئافرەت بەکار دەهێنرآ. توندوتیژی زاراوەیی رەفتارێکی ناسروشتی پیاوە دژ بە ژن و لە هەموو دنیادا دەستەواژە و فەزای زمانی تایبەت بەخۆی هەیە و لە بوارە جۆراو جۆرەکانی زمانەوانیدا بەرهەم دەهێنرێتەوە و درێژ دەبێتەوە بۆ نێو ئەدەب و هونەرەکانی دیکەی راگەیاندنی بینراو بیستراو، وەک چۆن هەندێجار سازکردنی ئەو فەزایە، مەرج نییە لە رێگای هاتنەگۆی زمانەوە بێت، بەڵکو دەشآ سیحری بێدەنگیش ئەو فەزایە بەرێوە بەرێت.

جیاکردنەوەی نێر و مێ.

جیاکردنەوەی نێر و مآ لە نێو خێزان بە رەگەزی پێکهێنەری هەموو خێزانێک دادەنرێت، نەک هەر هێندە بەڵکو بە بنەمایەکی قبوڵکراوی کۆمەڵگاش دێتە ژماردن. ئەو جیاکردنەوەیە لە هەموو ئاستە جیاوازەکانی ژیانی گشتیدا دەبێتە رێگرێک لە تێکەڵبوونی نێر و مآ. (پییێر بۆردیۆ١٩٣٠-٢٠٠٢) شیکردنەوەیەکی تێروتەسەلی لەبارەی نێو ماڵی تیرە و هۆزەکان کردووە و لەوێوە بۆی دەرکەوتووە، کە دنیای کۆمەڵایەتی لەسەر بەرانبەریەکی (نێر/مآ ) هەروەها (دەرەوە/ناوەوە) و (گشتی/تایبەتی) خۆی جێگیر دەکات. دەبآ بزانین، کە ئاماژەکردن بە بەرانبەریەکبوون، سەرەڕای ئەوەی جێگیربوونی باوک لە ناوەوە دەسەپێنآ، بەدیوەکەی دیکەش پەیوەندییەکی نایەکسان، لەنێوان تاکەکانی خێزان نیشان دەدات و لەوێشەوە زاڵبوونی نێر بە شێوەیەکی بەرفرەوان بەرجەستە دەکات. هەڵبەتە بەشێکی بەرفرەوانی ئەو شێوە پرۆسیسەکردنەش راستەوخۆ بە رۆشنبیریی تەقلیدی و ئایینەوە دەلکآ .
لەبەرانبەر نێر- مآ مەسەلەیەکی دیکە خۆی دەخاتە روو، ئەویش مەسەلەی شەرەفە و ئەو مەسەلەیەش راستەوخۆ پیاو دەگرێتەوە، خاڵی لاوازی ئەو مەسەلەیەش بە ئافرەتەوە بەندە، یان بە مانایەکی دیکە دەکەوێتە بواری سێکسەوە. پیاوان سنووری شەرەفییان لە حوکمکردن بەسەر ژنانەوە دیاری دەکەن. لێرە مەسەلەی شەرەف لەسەر بنەمایەک چەسپاوە ئەویش ئەوەیە، کە دەبآ کۆمەڵێک پیاو دان بە پیاوەتی یان نێرایەتی ئەو پیاوە دابنێن، کە بانگەشەی شەرەف لەنێو کۆمەڵآ پیاوی دیکە بەرز دەکاتەوە. شەرەفی ژنیش لەو شوێنەیە، کە بەختی ئەو ژنە لەنێو ژنانی دی دیاری دەکات، بەڵام ئەو شوێنە لە بنەڕەتدا دوای ئەو شەرەفە دێت، کە پیاو لە دەرەوە، بەختی خۆی لەسەر هەڵدەنآ. لەبەر ئەوەی شەرەف لەگەڵ نێرایەتی وەکیەک و هاوشان دێتەوە، بۆیە دەشآ بڵێین ژن بە ئەندازەی

دانپیانانی کۆمەڵێک پیاوەوە نەبآ، دان بە پیاوەتی مێردەکەیدا نانآ. نەریتی ڕۆشنبیریی لە بارەی شەرەفەوە پێماندەڵێ شەرەفی پیاو پێداویستییەکی ژنانەیە، چونکە ئەوە پیاوە سنووری دانپیانی ژن بە نێرایەتی خۆی دیاری دەکات و هەموو ژنێکیش لە ونبوونی مێردەکەیەوە هەست بە کەموکوڕی و بآ نرخی دەکات. بەگشتی دانان بە شەرەف لە یەککاتدا لە بەرژەوەندی ژن و پیاودایە. لەلایەکی دیکە گرفتی ئەو مەسەلەیە هەر تەنها پەیوەندی بە نێرایەتی مێردەوە نییە بەڵکو بە مێیایەتی ژنیشەوە دەلکآ .
دەشآ بەشێکی دیکەی ڕۆشنبیریی نێرایەتی بە دەستەواژەی توندوتیژی پیاوانەوە، یان ڕۆشنبیریی شەعبییەوە پەیوەست بکەین، ئەو ڕۆشنبیرییە بەشی هەر گەورەی لە هەژموونگەرایی نێرەوە سەرچاوەی گرتووە، بە تایبەتی لە زۆر بواری دیکەی ژیانی ڕۆشنبیری لە کۆمەڵگا خۆرهەلاتییەکان، بۆ نموونە لە کلتوری شەعبی مەغریبیدا وەک (فاتیمە مەرنیسی) لە وتاری (تێگەیشتنی ئیسلام لەبارەی سێکسگەرایی ئەکتیڤی مێیینەوە) دەیخاتە ڕوو، دەڵێت: ترس لە مێیینە لە ڕێگای بیروباوەڕێکەوەیەوە، کە پێیوایە جنۆکەیەکی بێزراو لە شێوەی ئافرەتێک بە ناوی "عایشەی قەندیش" خۆی دەردەخات، بە ڕاستی ئەو ژنە ترسناکە، چونکە شەهوانی و ئاڵوش و داوێن پیسە، بەو مەمکە بەرجەستە و لێوە شەهوانییەی بە ڕێگای تاریک و شوێنە تاریکەکاندا دەخولێتەوە، پیاوان دەخاتە داوی خۆیەوە، گەورەترین ئارەزووشی ئەوەیە، کە کردەی سێکسییان لەگەڵ ئەنجام بدات، تاکو هەتا هەتایە لەنێو جەستەیاندا بمێنێتەوە.ئینجا پێیاندەڵێت "ئێوە دانیشتووی ئێرەن". ترسان لە عایشەی قەندیش لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤی مەغریبی ئامادەگی تەواوی هەیە.. هەڵبەتە بە کەم سەیرکردنی مێینە لە زۆربەی کۆمەڵگاکانی دنیادا لە ڕێگای ڕۆشنبیرییەکەوە دەخریتە بەر چاو، کە بە ڕۆشنبیریی پیاو ناو دەنرێت. دەشآ بڵێین ڕۆشنبیریی شەعبی لە ڕێگای زاڵبوون و هەژموونی نێرایەتییەوە تەواوی مرۆڤایەتی دوچاری جۆرێک لە شۆک و سەرسامی دەکات، هەڵبەتە ئەوە هەر تەنها ڕۆژهەلات ناگرێتەوە، بەڵکو لە خۆرئاوا و تەواوی کۆمەڵگاکانەوە ئەو ڕۆشنبیرییە نێرینەیە تەواو بەرجەستەیە، بۆ نموونە پەندێکی یۆنانی دەڵێت: پەیمانەکانی ژن لەسەر ئاو دەنووسرآ. یان لە پەندێکی بولگاریدا دەڵێت: نە بڕوا بە ڕۆژی زستان بکە نە بە دڵی ئافرەت. یان پەندێکی ئیسپانی دەڵێت: ئافرەت وەک سێبەرە دوای بکەوی لێت ڕادەکا لێی ڕابکەیت دوات دەکەوآ...
ئەگەرچی مەبەست لەو نووسینە خوێندنەوەی ئەو دەستەواژە و زاراوە و پەندە جۆراوجۆرانە نییە، کە نێرگەرایی بە درێژایی مێژوو بەرهەمی هێناوە، بەلام کاتێک قسە لە ئافرەت لەنێوان ڕۆشنبیریی نێرایەتی و ئابلۆقەی زماندا دەکەین، ناتوانین پەنجە بۆ ئەو دەستەواژە و زاراوە و پەندانە ڕانەکێشین، بە دیوەکەی دیکەش فیکر و فەلسەفەش لەو نایەکسانییەدا ڕۆڵی یەکجار گەورەی بینیووە و بآ پەروا پەیڕەوی هەژموون و دەسەلاتی باو دەکات. کەواتە دەشآ بڵێین بە درێژایی مێژوو توندوتیژی زاراوەیی دژ بە ئافرەت، وەک دابێکی کۆمەڵایەتی خۆی جێگیر کردووە.

دەسەلاتی باوکایەتی.

شوێنی باوک لەنێو خێزاندا دەچێتە میانی ئەو هێلکارییەی، کە تاکە نێرەکانی بنەچەی لەسەر وەستاوە، هەڵبەتە ئەو هێلکارییە بە هێلکاری نێرانە ناو دەنرێت. لە زۆربەی جار ئەو مەسەلەیە هەر تەنها لە چوارچێوە خێزاندا ناخولێتەوە، بەڵکو بە خزم کەسوکاریشەوە پەیوەست دەبێت و هەندێکجاریش دەکەوێتە دەرەوەی پەیوەندی خزمایەتییەوە، کەواتە بنەچە لە ڕێگای باوکەوە دیاری دەکرێت، نەک دایک.
لە کتێبی (شوێنی باوک)دا دکتۆر ڕلدو ئاعوری (١٩٨٥) لە دووتوێی دەرئەنجامی نێوان گوتن و بیروڕادا لە بڕگەیەک لە بڕگەکان دەگاتە ئەوەی، کە ئەگەر دایک وەرگیراو بێت، ئەوە باوک داواکراوە، ئەگەر دایک پێدراوێکی سروشتی بێت، ئەوە باوک پێویستە بەردەوام جەختی لێ بکرێتەوە، ئەوەش مەیسەر نابآ تەنها بە دانپیانانی دایک نەبێت. بە مانایەکی دیکە باوک باوک نییە، ئەگەر دایک دانی پیادانەنێت.
وەک دەزانین یەکێک لە خەسڵەتەکانی دەسەلاتی باوکایەتی، خەسڵەتی کەم قسەکردنی نێوان تاکەکانی خێزانە، جا چ ئەو قسەکردنە ڕووبەڕووی باوک لەلایەن ژنەوە بێت یان منداڵەکان... بەو مانایەش وەک (نفیسە زردومی) دەڵێت: ڕێزگرتنی باوک بەر لە هەموو شتێک لەو بێدەنگییەدا خۆی دەبینێتەوە، کە دەست بەسەر تەواوی خێزاندا دەگرێت.

بێگومان هۆیەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە وشە تەنها لەنێوان هاوشاناندا نەبآ، قسەی پێناکرێت، ئەوەش بە مانای ئاڵوگۆڕی وشە دێت. بەمجۆرە لە میانی ڕۆشنبیریی تەقلیدیدا کاتێک یەکێک لە تاکەکانی خێزان، یان ژن لە ڕێگای وشەوە ڕووبەرووی مێرد دەوەستآ، هەست بە وشە ناکات، تەنها وەک نکۆڵیکردنی دەسەڵات نەبێت، بەو مانایەش دواندنی باوک وەک جۆرێک لە نکۆڵیکردنی دەسەڵاتی باوک دێتە ژماردن، بەڵام ئەو نەریتەی نێو خێزان، واتە دانانی ماوەیەکی جەستەیی لەنێوان قسەکەراندا، ئامانجیش ئەوەیە، کە نەبادە لە ڕێگای دەنگەوە ئاژاوە و سیحرێک بێتە ئاراوە، یان لە ڕێگای نائاگاییەوە جۆرێک لە وروژان و تێکچوون و شڵەژان بکەوێتەوە.

یەکێکی دیکە لە خەسڵەتەکانی دەسەڵاتی باوکایەتی کە بشآ ئاماژەی بۆ بکەین خۆی لە نواندنی توندوتیژییەکی جیاوازدا هەڵدەگرێتەوە، ئەویش توندوتیژی بێدەنگییە، جگە لە توندوتیژی جەستە، کۆی ئەو توندوتیژییانەش لە تەواوی بوارەکاندا دەرکەوتنیان زۆر بە جوانی دیارە، ئەگەر لە خێزاندا ئەو توندوتیژییەش لە ئارادا نەبێت، ئەوە پیاوی ئەو خێزانە بە پیاوێکی کەم و بآ شەرەف دەژمێردرێت. هەڵبەتە لە پشت ونبوونی وشە و ئامادەگی توندوتیژی پەیوەندییەکی پتەو هەیە، بە دیوەکەی دیکەش دەشآ بێدەنگی جۆرێک بێت لە قسەکردنی ناوەکی، کە ناشآ جگە لەو شێوەیە، شێوەیەکی دیکە لە دەرکەوتن لەو جۆرەوە هەبێت. وەک دەزانین دەلالەتی توندوتیژی لەو ناوکۆییەدا زۆر بەرتەسکە و ئەوەی، کە ممارەسەی توندوتیژی لەو مەجالەبەرتەسکە دەکات، هەمیشە دوچاری تەگەرەی خودی یان تەگەرەی ڕۆشنبیریی دەبێتەوە. بەمجۆرە لە ڕۆشنبیریی تەقلیدیدا ترس کلیلی وشە و تێگەیشتن لە ڕێزگرتنی لەنێو خۆیدا هەڵگرتووە، ترس یەکێکە لە جێگیرەکانی پەروەردەی تەقلیدی شەعبی، بۆ ئەوەی باوک شکۆی خۆی بپارێزآ، پێویستە وێنەی پیاوێکی بە شکۆ و بەرێزی هەبێت. جیاوازی منداڵەکانیش لەلای باوک لە تەرجەمەکردنی ڕێزلێگرتن و ئەو مەسافەیەدایە، کە دەکەوێتە نێوان منداڵ و باوکەوە.

بەڵام وەک دەزانین ئەو جۆرە توندوتیژییە، واتە توندوتیژی بێدەنگی لەگەڵ بەرفرەوانبوونی خێزان بەرە بەرە کەم دەبێتە، واتە هەر چەندە خێزان بەرفرەوانتر بێت، ئەوەندە ئەو جۆرە لە توندوتیژی سنوری تەسک دەبێتەوە.

گۆڕینی دەسەڵاتی باوک بە دەسەڵاتی دەوڵەت.

بونیادنانی دەوڵەت لە قۆناغی نوێدا و بە تایبەتی دوای سەربەخۆبوون، بووە هۆی کەمکردنەوەی ئەو پایە بەرزەی، کە باوک لە خێزاندا بە جۆری جیا جیا بەدەستی هێنابوو. دەشآ گەورەترین ئەو کاریگەرییانەی کەمکردنەی پایەی باوک لە هەڵوەشانەوەی (باوکی کۆ) یان سیستمی باوکسالاریدا بەرجەستە بکەین، وەک دەزانین کارفرمای باوک لە ڕابردوودا لە پرۆسیسەکردنێکی نیمچە کۆدا خۆی هەڵدەگرتەوە، واتە لەلایەن کۆمەڵێک باوک، مام، خاڵ، کوڕی مام و خاڵ هەتا نێری دراوسێش، جێبەجآ دەکرا، بەڵام ئەو پێشکەوتنەی، کە داگیرکەر لە ڕێگای دەستبەسەراگرتنەوە بەدەستی هێنا و گەیشتن بە ڕەتاندن و کۆچپێکردن، وای کرد، کە باوکان کارفرماکانی خۆیان زێتر وەک تاک جێبەجآ بکەن. وەک چۆن ئەو مینیتالیەتە کۆنەش هەر لەو ڕێگایەوە کۆمەڵێک گۆڕانکاری فرەچەشنی بەسەرداهات، ئیدی عەقڵیەتی باوکسالاری شێوەیەکی دیکەی لە دەسەڵات هێنایە ئاراوە، کە لە مامۆستای قوتابخانە و دەمودەزگاکانی دیکەی کار و فەرمانگەدا خۆی هەڵدەگرێتەوە.

لەلایەکی دیکەش ئەمرۆی مۆدێرنە ڕاستەوخۆ نکۆڵی لەو بەها تەقلیدییانەی بۆماوە دەکات، هەر لەوێشەوە وەک دەبینین بەهای سامان شوێنی بەهای شەرەف دەگرێتەوە، ئیتر پیاوەتی چیدیکە لە ڕێگای ئەو بۆ بۆماوەیەی، کە لە باب و باپیرانەوە بۆی ماوەتەوە، یان لە ڕێگای کرداری چاکە و پاراستنی پیاوەتی و دەسەبەسەراگرتنی ئافرەت وەک شەرەفی بنەچە پایەی خۆی بەرز ڕاناگرێت، بەڵکو وەک تاکێک و بەرهەمهێنانی شایستە و وەبەرهێنان و سەرمایە چ وەک بەدەستهێنان لە ڕێگای کارەوە یان لە ڕێگای بەختەوە پایەکانی خۆی لەنێو کۆمەڵگادا دەسەپێنآ، ئەو ئاڵوگۆڕییە سیستمی تەقلیدی وەک بزوێنەرێکی بنەڕەتی و دینامیکی، دەخاتە دواوە .

سێنترالیزمی نێرایەتی.

**لەنێوان کەلتور و حەقیقەتی بایۆلۆژی.**

**لە کتێبی "ژن، پیاو، ئاکاری سێکسی لە لانکەی شارستانیەتەکاندا" نووسینی "ویل دورانت ١٨٨٥-١٩٨١" وەرگێری کوردی "دلشاد خۆشناو" لە پێشەکیەکی کورتدا بیروڕایەک لە ڕستەیەک دەئاخنآ و دەڵێت: ژن و پیاو ئەو دوو نیوە ناتەواوەن، کە بە یەکگەیشتن و ئاوێتەبوون، یەک مرۆڤی کامڵ پێکدەهێنن. بێگومان تێگەیشتن لەو ڕستەیە و مانا چەپێنراو و پەنهانەکانی هەر تەنها قورسایی خۆی ناخاتە سەر دوو بوونەوەری ناتەواو، بەڵکو لە پەیوەندی نێوان ئەو دوو بوونەوەرە لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراو درێژ دەبێتەوە. من لێرەدا هەوڵدەدەم پرسی سەرەکی ئەو بەدواداچوونە لە دووتوێی پرسێکی سەرەکی دیکەوە، کە "پییێر بۆردیۆ" لە کتێبی "هەژموونی نێرایەتی" دەیخاتە ڕوو، ورد بکەمەوە. پرسیاری "بۆردیۆ" لەبارەی مێژووی پیاو و مێژووی ئافرەت لە بونیادی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییدا خۆی ڕوون دەکاتەوە، هەر لەوێشەوە هەوڵی شۆڕشێکی مەعریفی دەدات، بۆ ئەوەی هاوسەنگی نێوان ئەو دوو ڕەگەزە بە شێوەیەکی دیکە بەرجەستە بکاتەوە و چاوێکی دیکە بۆ سەیرکردنی پەیوەندییەکان بخاتە ڕوو. وەک چۆن پرسیار لەو میکانیزمە مێژووییەش دەکات، کە لەبەرانبەر هەتا هەتابوونی دابەشکردنی ژن و پیاو کار دەکات. بەو مانایە پرسی بۆردیۆ خستنەڕوو و بەدواداچوونی ئەو بیرکردنەوە ترانسندنتالەیە، کە گوتەزا فیکرییە جیاوازەکانی لەخۆدا ون کردووە. لێرەدا پرسی بۆردیۆ وەک (ئەمیل دۆرکایم ١٨٥٨-١٩١٧) دەڵێ گەڕانە بەدوای شێوەگەلەکانی پۆلینکردن، ئەو شێوەگەلەی کە دنیای نێر و دنیای مآ دەکێشآ، بەڵام شێوە تێڕوانینی وەرگێری کوردی پشت بە بیرکردنەوەیەکی ئایینی (لەسەر پرنسیپی لێکبوردن) دەبەستآ. من لەو نووسینەدا بە هاوکاری (پۆل ڕیکۆر١٩١٣-٢٠٠٥) هەوڵدەدەم ئەو پرسە لەلایەک لە ڕێگای ناوکی ئەفسانە و دواتر مێژوو و لەلایەکی دیکە لە ڕێگای ڕووە بایۆلۆژییەکەیەوە بخوێنمەوە.**

**بونیادی کۆمەڵایەتی/ بونیادی مەعریفی.**

**"ویل دورانت" لە کتێبی ناوبراودا ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە لە دوای قۆناغی دایکسالاری، دەرکەوتنی قۆناغی باوکسالاری گورزێکی توند بوو لە دەسەڵاتی ئافرەت درا، دواتریش، کە خاوەندارێتی تایبەت هاتە ناو ڕەوتی ژیانەوە، ئیتر ئەو گۆڕانکارییە هەر تەنها تەماشای ئافرەتی وەک کەلوپەل بۆ خۆشی وەرگرتن، نەدەکرد، بەڵکو خاوەندارییەکە گەیشتە ماوەی پێش هاوسەرگیری و پەردەی کچێنیشی گرتەوە، بۆیە نرخی کچ لە نرخی ژن زێتر بوو. دواتریش ئەوە دەدرکێنآ، کە لەنێوان زۆربەی هۆزەکان بارودۆخی ئافرەت جیاوازییەکی وای لەگەڵ کۆیلەدا نەبووە. لێرەدا دەمەوێت ئەو تێڕوانینە بۆ ئافرەت (بەتایبەتی لە دوای قۆناغی دایکسالاری) بە ئەفسانەکانەوە بەند بکەم، بەو مانایەی، کە مانەوەی ئەفسانە و دووبارە تەئویلکردنی وەک "پۆل ڕیکۆر" بۆی دەچآ شێوەیەکی تازە بە عەقڵ دەبەخشآ. کەواتە بە پێی بیروڕای ڕیکۆر کۆمەڵگاکان بە گوێرەی ئەفسانەکان جێگیربوونە و ئەفسانەکانیش مێژووی تایبەت بە خۆیان هەیە، بەو مانایە لەبەر ئەوەی کۆمەڵگاکان هەم بونیادیین و هەم مێژوویی، ئیتر پەرەسەندنیان هەم دایکرۆنییە و هەم سایکرۆنی، بەمجۆرە لە هەر کۆمەڵگایەکی تایبەتدا دابەشکردنی وەزیفەکان ڕەهەندێکی مێژوویی دیاریکراوی خۆیان هەیە.**

**لێرەوە هەڵوەستە لەسەر بە موڵکبوونی ئافرەت دەکەم، وەک ئەوەی "ویل دورانت" قسەی لەبارەوە دەکات، لە هەمان کاتیشدا هەڵوەستە لەسەر کتێبی "هەژموونگەرایی نێرایەتی"ی "بۆردیۆ" دەکەم، کە زۆر بە جوانی قسە لە بە کەلوپەلکردنی ئافرەت لە لایەن پیاوەوە دەکات بۆ خۆشی وەرگرتن، دواتریش هەوڵدەدەم وەک مێژووی ڕۆشنبیریی کۆمەڵگا، قسە لە ئاکار بکەم! بەڵام ئایا دەبآ لە کۆمەڵگای باوکسالاری ئاکار بە چ شێوەیەک پێوانە بکرآ؟ کامەیە ئەوەی کۆمەڵگای باوکسالاری بە خێر و کامڵبوونی خۆی دەزانآ؟**

**وەک دەرکەوتووە مێژووی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هەڵگری بنەمایەکی دیار و شاراوەی نێرسالارییە، ئەوەش بە پشت بەستن بە ویل دورانت، کە دەڵێ: سوودوەرگرتن لە وشەی "پیاوان" بۆ دیاریکردنی تەواوی جۆری بەشەر بریتییە لە دەمارگرژی سەردەمی باوکسالاری. لە هێنانەوەی ئەو تێگەیشتنەوە دەمەوآ مانا شاراوەکانی ڕستەی وەرگێری کوردی**

بخوێنمەوە و ڕەوتگەرایی و ئاڕاستەکانی هەڵوەشێنمەوە. هەر لەوێشەوە بە خوێنەران بڵێم مەبەستی ئەو تێڕوانینەی، کە ئەو دوو بوونەوەرە هاوشان دەکات و دەیانکات بە مرۆڤێکی کامڵ جگە لە سێکسکردن و بەکارهێنانی ئافرەت وەک کەلوپەلێک بۆ خۆشی وەرگرتن شتێکی دیکە نییە. نیازی ئەو تێڕوانینەی ئەو دوو بوونەوەرە وەک یەک دەبینێ تەنها لە بەخاوەنبوونی ئافرەت و بەکارهێنان و ئاڕاستەکردنیدا وەستاوە. بەو مانایەش ئەو ڕستەیەی وەرگێری کوردی ئەگەر وەک ڕستەیەکی بێ کردە بکەوێتە میانی چەمکی لێکبوردنەوە، ئەوە لێکبوردنی پیاو لە ئافرەت نەک هەر تەنها هاوسەنگی دروست ناکات، بەڵکو لە هێزەوە خۆی دەنووسێتەوە. کەواتە لە پشت ئەو ڕستەیە ماناکانی هەژموونی نێرایەتی بە شێوەیەکی ڕەمزی خۆی دەنوێنێ.

توندوتیژی ڕەمزی توندوتیژییەکی نەرم و بەزۆریش شاراوە و دەسەڵاتخوازانەیە، لە پەیوەندیگەلی بەرهەمهێناندا چ وەک مەسەلەیەکی بایۆلۆژی بۆ نموونە: لاقەکردن، یان کۆمەڵایەتی (ماڵ، کێڵگە، قوتابخانە، کارگە) دەردەکەوێت. هەژموونی نێرایەتی شێوەیەکی بەرزی شێوەگەلی توندوتیژییە. تێگەیشتن لەو شێوە پەیوەندییەی نێوان نێر و مێ، دەکرێ وەک دەروازەیەک بۆ تێگەیشتن لە پەیوەندییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی نێو کۆمەڵگا تەماشای بکەین، لەوانەش پەیوەندی نێوان دەسەڵات و ڕۆشنبیر، خاوە کار و کرێکار...، بەڵام توندوتیژی ڕەمزی بەپێی گوزارشتی بۆردیۆ هەتا بە نسبەت قوربانییەکانیش نەرم و هەستپێنەکراو و نەبینراوە .

بۆردیۆ هەژموونی نێرایەتی بە پێدراوێکی ئەنسۆپۆلۆژی دادەنێ ئەویش لە ڕێگای بونیادی نەستی، کە "کلۆد لیڤی ستراوس" لەنێو ئەدەبیاتدا قسەی لێکردووە و دەڵێ: کۆمەڵگا دێرینەکان هەژموونی پیاوی وەک تەبەنیکردن هەڵبژاردووە. لێرەدا دەمەوێ بڵێم لەبەر ئەوەی هەژموونی نێرایەتی لە تەواوی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا دەرکەوتە و شوێنکەوتەی جیا جیا و بەفرەوانی هەیە، بۆیە ناشێ قسە لە پرنسیبی هاوشان بوون و هاوتابوونی ئەو دوو ڕەگەزە لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی و ملکەچبووندا بکەین. ئەگەر هەر لەو بارەشەوە لە کۆمەڵگاکان ورد بینەوە دەبینین ئەو هەژموونە وەک دیاردەیەکی سروشتی ڕیشەی خۆی لە جیاوازی نێر و مێدا هەڵدەگرێتەوە و لەسەر ئاستی گەردوونی پرۆسیسە دەکرێ. لە ڕاستیدا ئەو هەژموونە وەک دەرئەنجامی بونیادی مێژوویی لە کۆی ڕەگەزە هاوشێوەکانەوە بەرجەستەیە و هەر بەمجۆرە بیر لە هەژموونی گوتەزا فیکرییەکان دەکەینەوە و بە بناغەی جیاوازییە فسیۆلۆژییەکانەوە بەندی دەکەین، ئەوەش بۆ خۆی بە جۆرێک لە پولینکردنی گەردوونی دێتە ژماردن: جولەکردن و بەرزکردنەوە.. یان دابەشکردنی شتەکان و چالاکییەکان و هەموو ئەوانەی بەپێی بەرەنگاری نێوان نێر و مێ دەرکەوتنەکانیان دەبینرێ وەک: (لەسەر/لەژێر، لەپێش/لەپاش، وشک/تەڕ، ڕەق/شل... یان بازاڕ بۆ پیاو و ماڵ بۆ ئافرەت، ئافرەت لە "چاو" زاڵە، پیاو لە "زیهن"... لەسەر ئەو بنەمایە دەتوانین بڵێین تەواوی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەسەر واقیعی سێکسی خۆی بونیاد دەنێت، لە ڕێگای پرنسیب و بۆچوون و دیدی سێکسی کۆی بەرنامە کۆمەڵایەتییەکان جولە دەکەن، یان بە مانا "بۆردیۆ"ییەکەی تەواوی گەردوون بە سێکسکراوە. ئەو بە سێککردنە بە پلەی یەکەم لەسەر خودی جەستە وەک واقیعێکی بایۆلۆژی و لەسەر مێژووگەرێتی وەک بنەمایەکی ڕۆشنبیریی خۆی دەنوێنێ. کەواتە کۆی بەرنامە کۆمەڵایەتیەکانی ژیان پشت بە بنەمای بایۆلۆژی و ڕۆشنبیریی و مێژوویی دەبەستێ، دواجار دەشێ کۆی ئەو پشت پێبەستنە لە ناوکی ئەفسانە جیهانیەکان بدۆزینەوە.

کەواتە ئەگەر بەشێکی ئەو دابەشکردن و پۆلینکردنە پەیوەندی بە توێکاری جەستەوە هەبێ، ئەوە وەک حەقیقەتێکی کۆمەڵایەتی لە دابەشکردنی کاردا خۆی دەنوێنێ. واتە ئەو نەخشەسازییە مەعریفییەی نێوان پیاو و ژن لەسەر دابەشکردنی ڕەگەزی بۆ کار و توێکاری جەستە وەک بنەمایەکی بایۆلۆژی ئیش دەکات، نەک لەسەر هاوشان بوون و هاوتا بوون. بەو مانایەش نەخشەیەکی مێژوویی و مەعریفی نییە ئەو دوو بوونەوەرە ناتەواوە، کامل و تەواو بکات. بە قەد ئەوەی مێژووییەکی دوور و درێژ هەیە هەژموونی نێرایەتی و بەکارهێنانی مێینە، لە شێوەیەکی بازنەییدا درێژ دەکاتەوە.

بەمجۆرە پیاوەتی بە ڕواڵەتە ئێتیکیەکەی خۆی وەک ماهیەتی هێز و پەیوەست بە شەرەف و بەرزێتی... نیشان دەدات، ئەوەش وەک ناوەڕۆک لە پیاوەتی جەستەیی دەلالەتەکانی هێزی سێکسییدا خۆی دەدۆزێتەوە: کونکردنی پەردەی کچێنی، پیتاندن، ئامادەگی و ڕەپبوونی ئەندامی نێرینەو... کەواتە ئەگەر ئامادەیی و قەڵەمڕەوی پیاو و ئەو

شوێنەی پیاوی لێیە بە ئاسایی دابنرآ، لۆژیکیانە بکەوێتەوە، ئەوە ملکەچبوونی ئافرەت و بەکارهێنانی و ئەندامەکانی زاوزێی ئافرەت جێگەی ڕەشبینییە، ئەو خەسڵەتە شەیتانیەیە، ئەو شوێنگەیەیە، کە بیرکردنەوە تێیدا دەکەوێتە بۆشاییەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەشآ وەک کودەتایەک بەسەر ئەندامی نێرینە تەماشای بکەین.

**ئەفسانەی نێرینەی هەمیشەیی و مێینەی هەمیشەیی.**

ژنایەتی و پیاوەتی، نێر و مآ، بە شێوەیەکی گشتی بە چەمکی "ڕەگەز/جەندەر"Gender-ەوە دەلکێن. جەندەر چەمکێکە لە لەسەر بنەمای ڕەگەز، جیاکاری لەنێوان پیاو و ژندا دەکات. بە مانایەکی دیکە دەشآ جەندەر هەڵوێستێکی دیار لەخۆ بگرآ یان ڕەفتاری کەسێک بێت. بە شێوەیەکی ڕوونتر جەندەر کردەگەلێکی جیاوازی ڕەگەزێکە لەسەر حیسابی ڕەگەزێکی دیکە، بە شێوە تەقلیدییەکەش ئەو شێوازگیریەیە، کە ڕەگەزی نێر لە ڕەگەزی مآ جیا دەکاتەوە. بەڵام بە هەتا هەتایی کردنی هەژموونی نێرایەتی بەوەی، کە هەمیشەیی و جێگیرە، ترسەکەی تەنها بەسەر مێینەدا نییە، بەڵکو ترسەکە لە توندوتیژی ئەفسانەی مێژووییەوەیە.

ئەگەر سەیری جەستەیی ژن و پیاو بکەین جیاوازییەکی بەرچاویان هەیە، ئەو جیاوازییە بۆ خۆی دەبێتە بەهایەکی دەستکرد، کاتآ قبوڵی گفتوگۆ ناکات. کەواتە ئەگەر بونیادی هەژموونی نێرایەتی بونیادێکی مێژوویی بآ و بەشێکی زۆری ئەو بونیادە مێژووییە بەرهەمی کار بآ، ئەوە بەرهەمێکە کە مێژوو بەردەوام بەرهەمی هێناوەتەوە و نەیتوانیوە بە شێوەیەکی دیکە لە دەرەوەی نێرایەتی ڕاڤەی بکاتەوە .

بەمجۆرە جێگیربوونی کۆمەڵگا بە گوێرەی ئەفسانەکانی نێرسالاری و بایۆلۆژییەوە، دوو خەسڵەت لەخۆ دەگرآ: خەسڵەتی ڕەمزی و خەسڵەتی مێژوویی. یەکەمیان لە ڕێگای شیکردنەوەی بونیادی ئەفسانەکانەوە دەردەکەوآ. دووەم لە ڕێگای کردەی دووبارە ڕاڤەکردنەوەی مێژوو. ئەگەرچی ئەفسانەکان مێژووی تایبەت بەخۆیان هەیە، بەڵام بونیادی ئەفسانەی هەمیشە نێر و هەمیشە مآ لە کۆی ئەفسانەکاندا هاوبەشییەکی تەواو لێکنزیکیان هەیە، هەر لەو ڕووەشەوە دەتوانین بڵێین ئەفسانەکانی هەمیشە نێر و هەمیشە مآ، هەم بونیادیین و هەم مێژوویی. بەمجۆرە تاکی مێی نێگەتیڤ و تاکی نێری پۆزەتیڤ لە ڕێگای هەلومەرجی دیاریکراوی ڕەمزی و مێژووییەوە ئەزموون دەکرێتەوە. کەواتە هەژموونی نێرایەتی لەلایەک بە شێوەیەکی ڕەمزی لە ڕێگای ئەفسانەکانەوە ڕۆڵی خۆی دەگێرآ، ئەگەر کۆمەڵگا لێی بەئاگا بآ یان بآ ئاگا، لەلایەکی دیکە لە ڕێگای قەڵەمڕەوی عەقڵی نێرینەوە دەست بەسەر مێژوو و دووبارە ڕاڤەکردنی مێژوودا دەگرآ و خۆی بەرهەم دەهێنێتەوە.

بەڵام هەندآ لە نووسەران بیروڕای دیکە لە بارەی "ڕەگەز/جەندەر "Gender-دەخەنە ڕوو و جیاکارییەک دەخەنە نێوان مەسەلەی بایۆلۆژی و ڕۆشنبیرییەوە، بە بڕوای ئەوان چەمکی نێر و مآ لە ڕێگای جەستەوە وەک مەسەلەیەکی بایۆلۆژی دیاری ناکرآ، بەڵکو کلتورە ئەوە ئەو مەسەلەیە یەکلا دەکاتەوە و لەوێوە نرخ و بەهای نێر و مآ دیاری دەکات، واتە دەیانەوآ بڵێن ڕاستە "مآ "Female- مەسەلەی ڕەگەزە، بەڵام "مێیایەتی "Femininty-مەسەلەیەکی ڕۆشنبیرییە. هەر لەسەر ئەو بنەمایەش هەندآ لە ئافرەتان ڕووبەڕووی مەسەلە بایۆلۆژییەکان دەوەستن، وەک توانایەک، کە ئاڕاستەکانی مآ دیاری دەکات. وەک چۆن هەندێکی دیکە لە ڕۆشنبیران حەقیقەتی بایۆلۆژی مآ وەک: سکپڕی، شیردان، بێنوێژی... بە بەشێکی جیاوازی ژنانە دەژمێرن و هانی ئافرەتان دەدەن ئەو جیاکارییەی خۆیان بە هەند هەڵگرن و نەیشێوێنن.

**ئەفسانە/ڕاڤەکردن.**

قسەکردن لە دووبارە ڕاڤەکردنی مێژوو، پێویستە قسەکردن بآ، لە هەڵوەشانەوەی کۆی ئەو تێزە تەقلیدی و دۆگمایەی، کە چەمکەکان و چەمکی نێر و مێی لەسەر بونیاد نراوە. بە مانایەکی دیکە دەمەوآ بڵێم ئەو گوتەزایەی "ریکۆر"، کە دەڵێ "کۆمەڵگاکان بە گوێرەی ئەفسانەکان جێگیر بوونە" و "کۆمەڵگاکان بە ئاگا بن یان بآ ئاگا بن،

**ئەفسانەکان ڕۆڵی خۆیانی تێدا دەگێڕن" لەوێوە بەشێک لە کۆنەپارێزی دەنوێنآ، کە ناتوانآ بە شێوەیەکی دیکەی مۆدێرن و جیاواز درێژە بە خۆی بدات، وەک چۆن لە عەقڵییەتێکی چالاک و زیندووەوە دەتوانآ ڕاڤەی سەردەمییانە بۆ ناوکی ئەو ئەفسانانە بکات و بە ئیقاعی سەردەم و پرسی سەردەم بارییان بکات. کەواتە مانەوەی ئەفسانەکان بەو شێوەیەی، کە "ریکۆر" باسی دەکات، پێویستی بە دووبارە تەئویلکردنەوە هەیە، بەو مانایەی، کە دووبارە تەئویلکردن دەقێکی دیکەی جیاوازە.**

**ئەگەر دووبارە تەئویلکردن دەقێکی نوێی جیاواز بآ، کەواتە کرۆکی مانەوەی شێوە تەقلیدییەکەی چەمکی نێر لەنێو کۆمەڵگاکاندا ڕاستەوخۆ بەو عەقڵییەتەوە بەندە، کە هەمیشە وەک کۆنەپارێزێک خۆی دووبارە کۆپی دەکاتەوە، نەک وەک تێڕوانین و دەقێکی دیکەی جیاواز، نەک وەک ئیقاعی سەردەم و پرسی سەردەم. چونکە عەقڵی کۆنەخواز ئەو توانایەی تێدا نییە، کە لەگەڵ پرسی سەردەم و ئیقاعی سەردەم بێتەوە .**

**لێرەدا عەقڵییەتی نێرسالاری هەمیشە ڕەگەزی مآ وەک بوونەوەرێکی کەم دەبینآ و پێیوایە تەواوبوون و کامڵبوونی مآ هەر تەنها لە رێگای ئەویدیکەی نێرەوە نەبآ مەیسەر نابآ، ئەو فیکرەیە بەشێکی زۆری لە کۆنەخوازی لەخۆدا هەڵگرتووە، بۆیە دآ لە ڕستەیەکی ڕەمزی و لە هێزێک، کە پێیوایە توانیویەتی هاوسەنگی لەو نێوانەدا دروست بکات,,, لە هەژموونێکەوە، کە خۆی بە لێبوردەخواز دادەنآ، کامڵبوونی مرۆڤ لە ئاوێتەبوونی دوو نیوە ناتەواو "ژن و پیاو" دەبینێتەوە. ئایا هەر ئەو عەقڵییەتە کۆنەخوازە نییە، کە جیاوازییەکانی ئافرەت "بێنوێژی مانگانە، سکپڕی، شیردان..." بە هۆی لاوازی ژن دادەنآ؟ !**

**"مانۆ"ی هیندی دەڵێ: ژنی وەفادار دەبآ بە شێوەیەک خزمەتی سەروەرەکەی بکا وەک بڵێی ئەو خوایە، هەرگیز کارێک نەکات، کە ئازارێک لەوەوە بە مێردەکەی بگات، باری کۆمەڵایەتی پیاو و هەبوون و نەبوونی باشی زۆر کاریگەری زۆری لەسەر ئەو مەسەلەیە نییە، هاوسەنگی ئەگەر لاساری لە ملکەچی مێردەکەی بکات لە دۆنادۆنی دواتر دەبێتە چەقەڵ.  پرسیار ئەوەیە ئایا ئەو عەقڵییەتە بەو هەموو مەزنایەتییەی خۆیەوە دەتوانآ بە شێوەیەکی دیکەی جیاواز خۆی تەرجەمە بکاتەوە... ئایا هەر ئەو عەقڵییەتە نییە لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکان جا چ بە ئاگابن یان بآ ئاکا دووبارە خۆی بە هەمان شێوەی کۆن و پێشوو بەرهەم دەهێنێتەوە.... دواجار دەمەوآ بڵێم لەو نێرسالارییە پڕ شکۆیەدا کآ باوەڕ بە ڕستەی وەرگێڕ: "ژن و پیاو ئەو دوو نیوە ناتەواوەن، کە بەیەکگەیشتن و ئاوێتەبوون یەک مرۆڤی کامڵ پێکدەهێنآ" دەکات؟! کەواتە لە کوێ ئەو دژ بەیەکبوونە گەردوونی و ڕۆشنبیرییە دیاریکراوەی پەیوەندی نێوان نێر و مآ بۆمان دەردەکەوآ، کە عەقڵییەتی کۆنەخواز و ڕۆشنبیریی شەعبی کۆمەڵگاکان وەک پێویست ناتوانن عەقڵ و بیرکردنەوەیان بە ئیقاع و پرسی سەردەم بارگاوی بکەن، بۆیە هەتا ئێستاش شکۆی خۆیان لە هەژموونی نێردا دەبینن و کۆی ئەو هەژموونەش بە دیاردەیەکی سروشتی ڕەگ داکوتاو سەیر دەکەن، هەرگیز بیر لە تەرجەمەکردنێکی دیکە و تەئویلکردنێکی دیکەی جیاواز ناکەنەوە، بەو مانایەش لەنێو کۆمەڵگای کۆنەخواز و ئاڕاستەکراو بە ڕۆشنبیریی شەعبی، دەسەڵاتی نێر ڕەهەندێکی مێژوویی دیاریکراو لەخۆ دەگرآ و بە هەمان شێوە تەقلیدی و دۆگمەکە، خۆی لە ڕێگای دامەزراوە پەروەردەییەکان: خێزان، دەوڵەت، مزگەوت، کەنیسە، هەروەها دامەزراوەکانی دیکە کۆپی دەکاتەوە. دەمەوآ بڵێم لە ڕێگای ئەو کۆپی کردنەوەیەدا دووبارە دەرکەوتنی ئەفسانە سەرەتاییەکان بە هەمان شێوەی پێشوو دەبینین، کە لە ڕێگای عەقڵییەتی بنبەستوو دەسەڵات دەگرێتە دەست، بە دیوەکەی دیکەش بە عەقڵکردنی ئەفسانەی هەژموونی نێرایەتی، خۆی چەشنێکە لە زیندووبوونەوەی شێوە کۆنەخوازەکەی ئەفسانە. کەواتە وەک "بۆردیۆ" دەڵێ: نێرایەتی وەک ئەوەی دەیبینین گوتەزایەکی عەقڵانییە تا ڕادەیەکی توند لە پێناو پیاو و دژ بە ئافرەت لە ڕووبەڕووبوونەوەدایە، ئەوەش هەر ترسان لە ئافرەت ناگەیەنآ، بەڵکو یەکەمجار ئەو ترسە لە خودی ئافرەتیشدا بوونی هەیە.**

**هەژموونی ڕەمزی.**

هێزی ڕەمزی شێوەیەکە لە شێوەکانی دەسەڵات و لەسەر جەستە پراکتیزە دەکرآ و ڕاستەوخۆ دەکەوێتە دەرەوەی ڕقلێبوونەوەی جەستەیی و پشت بە بزوێنەرە هەستییەکان دەبەستآ و دەکەوێتە ناوەوە، واتە قوڵاییەکانی جەستە. هێزی ڕەمزی هەستی ناوەوەی جەستە کۆنترۆڵ دەکات، بۆ نموونە: عەیبە، شەرم، نیگەرانی... یان شێوەکانی سۆز و خۆشەویستی وەک: سەرسامبوون، ڕێزگرتن... هەڵبەتە ئەوەی دووەم هەستێکی زیاد لە پێویست ئازاردەرە هەر بۆیەشە سووربوونەوە و بەدحاڵیبوون و لەرزین و تووڕەیی... تێدا دەبینرآ. وەک دەزانین هەموو ئەوانەش شێوازی جیاوازن بۆ ملکەچکردنی مآ و جۆرێک لە ململانێی ناوەوە و دوولەتبوونی "من"ی مآ و دابەزین و کەوتنە بۆشایی و شکست و خاوبوونی مآ نیشان دەدەن، لەبەرانبەر ئەوەشدا دەلالەت لە گەیشتن بە پلەی چێژی پیاوانە دەکەن، ئەو چێژەی کە پیاو بە نیشانەی پیاوەتی خۆی ناسی دەکات.
کەواتە ئەگەر پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەسەر هەژموون وەستا بآ و هەژموونیش لەسەر پرنسیپی دابەشکردنی جەوهەرییانەی نێوان نێری چالاک و مێی خاو بونیاد نرابآ، ئەوە ئەو پرنسیب و ڕێکخستنە تەعبیر و ئاڕاستەی ئارەزووی نێر لە بەخاوەنبووندا دەبینآ و هەر لەوێشەوە بەرەوە شەبەقییەت (ئیرۆتیزم) هەنگاو دەنآ، وەک چۆن بە دیوەکەی دیکەش ئارەزووی مێینەش لە ڕێگای هەژموونی پیاو و ملکەچبوونی مآ ڕوو لە ئیرۆتیزم دەکات. بێگومان هەموو ئەو دید و تێڕوانینانەش لە عەقڵیەتێکەوە سەرچاوە دەگرآ، کە نێر ڕابەرایەتی دەکات، بەڵام وەک دەزانین بنەمای ئەو تێڕوانینە لەسەر فیکرەی پێناسەکردنی کۆمەڵایەتیانەی جەستە دروست نەبووە، بەڵکو بەپێی جۆرەکانی پەیوەندی نێوان نێر و مآ ڕێکخراوە. کەواتە چ نێر چ مآ، دەتوانن ڕەمزی نێرایەتی بە شێوەی جیاواز دابمەزرێنن، دروستکردنی ئەو جۆرە کەشە لە ڕەمز زۆرجار پێویستی بە ئامادەگی پیاوەوە نییە، بۆ دژەکەش هەروایە. بە دیوەکەی دیکەش وەک ئاشکرایە دەتوانین جیاوازییەکانی جەستە لە ڕووی بایۆلۆژییەوە نیشان بدەین. کەواتە دەکەوینە بەرانبەر دوو جۆر لە دیدی کۆمەڵایەتی یەکێکیان پەیوەندی بە کۆپیکردنی کۆنەخوازانەی ئەفسانەکان و کلتورەوە هەیە، ئەویدیکە لەسەر بنەمای بایۆلۆژی بەرجەستە دەبێت. ئەگەر یەکەمیان بشآ لە ڕێگای عەقڵیەتێکی مۆدێرنەوە قابیلی دووبارە ڕاڤەکردن بێت و دەقێکی جیاواز بخاتەوە، ئەوە دووەمیان دەشآ وەک دەرکەوتی جیاواز و تایبەت تەماشا بکرآ.
بەکورتی کۆپیکردنی کۆنەخوازانەی کلتور و پرۆسیسەکردن و درێژەدان بە شێوەی ڕەمزییانە، بۆتە سروشت و سیمای کۆمەڵگا کۆنەخوازەکان و لەوێشەوە وەک جۆرێک لە توندوتیژی ڕەمزی خۆی دەنوێنآ، بەو مانایە توندوتیژی ڕەمزی جەخت لە عەقڵییەتی کۆنەخوازانە دەکات و پەنجە لەسەر قوربانییەکانی توند دەکاتەوە. لێرەدا عەقڵییەتی کۆنەخواز وەک کردەیەک، ڕێگا بە هێز و دەسەڵاتی خەوتووی ناوکی ئەفسانەکان دەدات و تەواوی ئاماژە و نیشانە و هەڕەشە و وروژن و فەرمانەکانی ڕێکدەخاتەوە و درێژە بە پراکتیزەکردنی بداتەوە.

ئافرەت لەنێوان ئابوری و چێژی ڕەمزی.

بازاڕی ژن و مێردایەتی دەکەوێتە میانی مامەڵەکردن و ئاڵوگۆڕی ڕەمزی و پانتایی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەی ڕەمزییەوە. بە شێوەیەکی گشتی لەو سیستمە کۆمەڵایەتیەدا ئافرەت وەک شت یان باشتر بڵێین وەک ڕەمز سەیر دەکرآ و بەمجۆرەش مانای ئافرەتبوون دەکەوێتە دەرەوەی ئەو خودەی، کە بە ئافرەت ناوزەد کراوە و وەزیفەکەشی لە دووتوێی بەشداریکردن و زیادکردنی سەرمایەی ڕەمزی پیاوادا خۆی هەڵدەگرێتەوە. کەواتە دیاریکردنی حەقیقەتی ئافرەت و شوێنگەی ڕێگاپێدانی لە دژەکەیەوە کەشف دەکرآ، بۆ نموونە لەوێوە ئافرەت وەک شت تەماشا دەکرآ، کە بەرەو ماڵە مێرد دەیگوازنەوە، وەک چۆن یەکێک لە وەزیفە سەرەکییەکانی ژن منداڵ لەسک هەڵگرتن و بەخێوکردنە، بەو مانایەش ئافرەت وەک شت و ئاڵوگۆڕی پێویستە بەردەوام لەبەرژەوەندی پیاوادا بێ و سەرمایەی پیاو زیاد بکات.
کەواتە خوێندنەوەی پەیوەندی نێوان ژن و مێرد خۆی لە پەیوەندی هێزی ڕەمزییدا دەبینێتەوە و تەواوی ئامانجەکانیشی پێویستە لە زیادکردنی هێزی پیاوادا بێت، سەرەڕای ڕاڤەکردنی ئابوری ڕووت، کە شێوازی بەرهەمهێنانی ڕەمزی لەگەڵ شێوازی بەرهەمهێنانی ئابوری تێکەڵ بەیەکتر دەکەن و وا مامەڵە لەگەڵ ژنان دەکەن، وەک ئەوەی کاڵایەک بێت و بەشداریەکی بنەڕەتی لە ئابوری چێژی ڕەمزییدا هەبێ، یان بە مانایەکی دیکە لەو

ئاڵوگۆڕییەدا وەک کاڵایەک پیاو بیکاتە هی خۆی و چێژی لێوەرگرآ و بەکاری بهێنآ. بەمجۆرە لەوێوە پیاو، ئافرەت بە شەرەفی خۆی دەزانآ، کە وەک کاڵایەک خاوەنداریێتی دەکات و بە سەرمایەی ئابوری ڕەمزی خۆی دادەنآ. کەواتە ئافرەت لەنێوان پیاواندا بابەتی ئاڵوگۆڕییە، پیاویش بەردەوام خۆی بە لێپرسراو و بەرهەمهێن و دووبارە بەرهەمهێنانەوەی دادەنآ.

ئافرەت بەردەوام بۆ کاری ئاڵوگۆڕی لەلایەن پیاوانەوە بەرهەم دەهێنرێتەوە. ئافرەت وەک سەرمایەی ڕەمزی و سەرمایەی کۆمەڵایەتی لەلایەن پیاوانەوە دەستی بەسەردا گیراوە و قۆرخ دەکرآ، لەلایەکی دیکە ئابوری چێژی ڕەمزی دەلالەت لە ئامادەگی ژنانە دەکات، ئەوە ئامادەگی ژنانەیە، کە تێڕوانینی ئابوری بۆ شتەکان (واتە ئافرەت وەک شت) دەگۆڕآ، ئەوە ئامادەگی ژنانەیە بەشداری لە ئاڕاستەکردنی ئەو تێڕوانینە دەکات و بۆ ئەو بەشدارییەش دەشآ مەرجی دیاریکراوی هەبێ، هەر لەوێشەوە دەشآ ئاڵوگۆڕی ژن و مێردی لەسەر ڕێک بخات.

بەڵام وەک دەزانین ئەگەر ئافرەتان بۆ کاری کۆمەڵایەتی ملکەچ بکرێن و بە بچووک دابنرێن و نکۆڵییان لێبکرآ و نەتوانن فەزیلەتی خۆیان پرۆسیسە بکەن، ئەوە پیاوانیش بە بڕوای "بۆردیۆ" دەکەونە نێو هەمان زیندان و دەبنە قوربانی، نەک لەبەر ئەوەی هەژموونیان بەسەر ژنانەوە هەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی داواکراون هەژموونیان هەبێ، لەبەر ئەوەی بوونی خۆیان لەو ئەرکەدا دەبینێتەوە. کەواتە لەنێوان فەزیلەتی پیاو و ڕەزیلەتی ژندا هەموو ئەو کارانەی، کە ژن پێی هەڵدەسآ بەهەند هەڵناگیرآ، بەڵام هەموو ئەو کارانەی پیاو پێی هەڵدەسآ بە گرنگ سەیر دەکرآ، هەتا ئەگەر چێشتلێنان و بەرگدوورینیش بێت. بەمجۆرە ئەو پێوانەیەی، کە ژنانی پێهەڵدەسەنگێنرآ گەردوونی ناکەوێتەوە، بەڵام ژنان لە بزاڤی ژنانەیاندا بە گەردوونی لە قەڵەمی دەدەن، بێ ئەوەی بیر لەو هەژموونە کاریگەرییەی پیاوان بکەنەوە .

لێرەدا ئامانجی هەژموونداری نێرینەیی هەمیشە ژن وەک بابەتێکی ڕەمزی دەخاتە ڕوو، وەک ئەوەی بوونی ژن لە پێناو تەماشاکردنی پیاواندابێ، بۆیە بەردەوام ئەوە ئافرەتی نەرم نیان و جوان و سەرنجڕاکێش و دەم بە خەندە و ملکەچە تەواوی خەسڵەتە تایبەتییەکانی ڕەگەزی مێی تێدا بەرجەستەیە و قابیلی ئاڵوگۆڕی زێتری پیاوانن، بەڵام ئەگەر پێچەوانەی ئەو خەسڵەتانە بکەونەوە، ئەوە پیاوان ناتوانن وەک پێویست هاوگونجانیان لەگەڵدا دروست بکەن. کەواتە ئەگەر ژنان نەتوانن وەک پێویست خۆیان بۆ تەماشکردنی پیاوان ئامادە و ملکەچ بکەن، ئەوە تەگەرەیان هەیە و وەک مەسەلەیەکی بونیادی ناتوانن وەک شت بۆ بازاری چێژی ڕەمزی خۆیان بنوێنن. وەک دەزانین فیکرەی ئاڵوگۆڕی ژنان لەسەر دەستی "فرۆید" و "ستراوس" پەرەی سەندووە و ئەو تیۆرە وای دەبینآ، کە ژنان دەشآ بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان پیاوان بەکار بهێنرآ.

بەڵام لەمرۆی مۆدێرنەدا ئەوە هەوڵی فیکری و مەعریفی و ئایدیۆلۆژی بزاڤی ژنانە، کە دەیەوآ کۆی جیاوازییە ڕەگەزییەکان بە ناسروشتی بژمێرێت و چواچێوەکان و پۆلینکردنەکان بە دەستکردی نێرسالاری بداتە قەڵەم و لە جیاوازی ڕۆشنبیریی و ژیارییدا هەڵیگرێنەوە، هەروەها هەموو ئەوانی دیکەی وەک پیرۆزیی و پیسی، گشتی و تایبەتی، ئەسڵی و بێگانەیی... وەلا دەنێن و بە ئاژاوەی سیستمی ناوی دەبەن .

"ئێریک زیمور" لە کتێبێکی بە ناوی "ڕەگەزی یەکەم " جیاوازی لەنێوان دوو جۆر لە دینامیکیەتی بزاڤی ژنانە لە خۆرئاوادا دەکات و بەمجۆرە دەیخاتە ڕوو: ژنان لە نیوەی دووەمی چەرخی ڕابردوو هەوڵیاندا ببنە پیاو، بەڵام کاتآ سەرکەوتنیان لەو دەرفەتەدا بەدەست نەهێنا، گوتییان لەسەر پیاوانە، کە ببنە ژن! لە قۆناغی یەکەمی هەڵسانەوەی ئافرەتاندا، ئافرەتان توانیان مافی هەڵبژاردن و تەڵاق و لەباربردن و هۆیەکانی سکپڕنەبوون و ئازادی سێکسییان بەدەست بهێنن... بەڵام هەموو ئەو بەخششانە دواجار کپبوونی نەوەی "٨٩" لێکەوتەوە، ئیتر دایکان بە تەنها لەگەڵ منداڵە بێ باوکەکانیان مانەوە، چێژی سێکسی لە ئاستێکی نزمی یانەکان پرۆسیسە دەکرا، کۆمەڵێکی زۆر وەک هۆمۆ بە دڵتەنگی ژیانیان بەسەر دەبرد... هەندآ لە ژنانیش دەیانەویست بگەنە ناوەند و شوێنگەی کۆمەڵایەتی و پیشەیی و سیاسی بەرز بەدەست بهێنن و ڕێز بۆ خۆیان بگێڕنەوە و هەوڵیاندەدا سیستمی دایکسالارییان بەسەر سیستمی باوکسالاریدا بسەپێنن، بۆیە دەکەوتنە مشتومڕی ئەوەی، کە پیاوان بە کاری نێو ماڵ هەڵسن... لەلایەکی دیکە گرفتە

**جەوهەرییەکە کەوتە نێو کاری سێکسکردن و دواجار وای لێهات ژنان هەتا ڕووخساری دەرەوەشیان وەک پیاوان لێدەکرد، گرنگییان بە جوانی خۆیان نەدەدا، بۆ ئەوە ئارەزووی پیاوان لەخۆیان دوور بکەنەوە.**
**بەڵام قۆناغی دووەم، کە ئەمرۆ خۆرئاوا پراکتیزەی دەکات، قۆناغی بە ژنبوونی پیاوانە، ئەو قۆناغە لەگەڵ هەرەسهێنانی قۆناغی یەکەم، واتە بە پیاوبوونی ژن دەستی پێکرد، ئەو کاتەی، کە ژن دانی بەوەدانا، کە وەک ڕەگەزێکی بنەڕەتی لە ژیانیدا پێویستی بە پیاو هەیە، بەڵام نەک وەک ئەوەی وەرگێڕی کوردی بیری لێدەکاتەوە! وەک چۆن ئافرەتی ئەمرۆ پیاوی نێری وەک کازانۆڤ (Casanova) و دۆن جوان (Don Juan) ڕەتدەکاتەوە. ئافرەتی ئەمرۆ پیاوێکی دەوێ، کە وەک پێویست بە خۆشەویستی و وەفاوە بەشداری لە ژیانیدا بکات.**

**چەمکی توندوتیژی لەنێوان فیکر و زانستدا.**

**پێشەکی:**

**بە گشتی توندوتیژی بۆتە جێگەی بایەخی کۆمەڵێک لە توێژەرانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و دەروونی، ئەوەش بەشێکی زۆری ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ڕەنگدانەوەی فیکری ئەوروپی و ڕابوونەوەی فیکری ئوسوڵییەوە هەیە. هەڵبەتە فیکری ئەوروپی دەستی بەسەر ئەو سێ سەدەیەی دواییدا گرتووە و هەر لەوێشەوە بایەخ بە سروشتی مرۆیی و پەیوەندی تاک بە دەوڵەت... دەدەن. بێگومان ئەو دەستبەسەرداگرتنەش بۆ خۆی کۆمەڵێک گرفتی جۆراو جۆری هێناوەتە بەرهەم..**
**)فریدریک ئینگلز)ی زانا، ئاشکرای کرد، کە تیۆری (ناتوندوتیژی) لەمیانی کۆی ئەو ڕاڤەکردنانەوە دەرکەوتووە، کە بۆ مەسەلە ئابوری و سیاسییەکان تەرخانکراوە.. بەمجۆرە دەشێ ئەو توندوتیژییەی، کە تاکو ئێستاش لە دەزگاکان وەک شتێکی باو ماوەتەوە و بەکاری (دوورخستنەوە) سەرەتاییەکان هەڵدەسێت، دووبارە وەک دیاردەیەکی ئابوری سیاسی ڕاڤەی بکەینەوە .**
**لێرەوە ئەو گەلانەی، کە لەژێر باری بێبەشکردن لە ژیان دەناڵێنن توندوتیژی زێتر قبوڵ دەکەن لەبەرانبەر ئەوانەی، کە بەو ژیانە ناچار نەکراون، یان لەپەنای سۆز و خۆشیدا ژیان بەسەر دەبەن. پسپۆران بۆ بەرپەرچدانەوەی توندوتیژی جەخت لە سروشتی مرۆیی دەکەنەوە ئەویش دەبەستنەوە بە :**
**(سروشتی مرۆیی چاکەخواز، سروشتی مرۆیی شەڕخواز)**
**(ئیبن خەلدون ١٣٣٢-١٤٠٦)ی بەناوبانگ، توندوتیژی وەک بەشێک لە سروشتی خودی مرۆڤ دەبینێت (زوڵم و دوژمنکاری لە ڕەفتارەکانی مرۆڤ دەژمێردرێت). هەروەها فەیلەسوف ئینگلیزی (تۆماس هۆبز ١٥٨٨-١٦٧٩) پێیوایە سروشتی مرۆڤ پڕ لە توندوتیژییە، نائاسودەیی ڕقەبەرایەتی مرۆڤ بەرەو شەڕی هەمووان بەدژی هەمووان دەکاتەوە.**

**چەمکی توندوتیژی:**

**توندوتیژی ڕەفتارێکە یان کردەیەکی دوژمنکارییە تاک یان کۆمەڵ یان چینێکی کۆمەڵایەتی یان دەوڵەتێک لە چوارچێوەی هێزێکی ناهاوتای ئابوری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، دەروونی... لەبەرانبەر تاک یان کۆمەڵ یان چینێکی کۆمەڵایەتی یان دەوڵەتێکی دیکە پێی هەڵدەسێ، بۆ ئەوەی دەستی بەسەردا بگرێت.**

**چەمکی زمانەوانی توندوتیژی:**

**توندوتیژی لە زمانی عەرەبیدا واتە جیاوازی لە فرمان، کەمی لە سۆز و میهر. توندوتیژی سۆز و میهرەبانی تێدا نییە، دەکەوێتە بەرانبەر سۆز و میهر، یان بەسەر سۆز و میهردا دەکرێت، تەعبیر لە مامەڵەکردنێکی بەد دەکات.**

توندوتیژی ماناکانی لە سەرزەنشتکردن، زەبر، سەختی وەرگرتووە. سەختی تا ئەوپەڕی... بەمجۆرە توندوتیژی بۆ ئەو کۆمەڵە کردەیە دەگەڕێتەوە، کە لێرە ئاماژە پێکراوە، هەروەها کۆمەڵێک مانای زێتریش لەخۆ دەگرێت...
لەژێر ئەو ڕۆشناییە دەتوانین بڵێین توندوتیژی لەگەڵ مرۆڤدا لەدایکبووە، لە میانی ئەو مێژووە دوور و درێژەیشەوە کۆمەڵێک شێوەی جۆراوجۆری لەخۆداهەڵگرتووە. بەپێی پێناسەکردنی (ئیسکۆپیدیای زانستە کۆمەلایەتیەکان) مەبەست لە توندوتیژی، کە لەمیانی ناوکۆیی کۆمەلایەتیدا خۆی لە بەکارهێنانێکی نایاساییانە یان نارەوایی هۆیە ناپەسەندە مادییەکاندا هەڵدەگرێتەوە چ لەپێناو مەبەستی تاکە کەسی یان مەبەستی کۆ بێت.
بەڵام (مەوسوعەی زانستی) ئاماژە بەوە دەکات، کە چەمکی توندوتیژی لەلایەن تاک یان کۆمەڵ بە دژی تاک یان کۆمەڵێکی دیکە دەکرێتەوە، جا چ وەک قسە پێگوتن بێت یان بە بەجێهێنانی کردە بکرێت. بەمجۆرە توندوتیژی کردەیەکە لەبەرجەستەکردنی هێزەوە دێتە بەرهەم، جا ئەو هێزە فیزیکی بێت یان ڕەمزی.
)بیرفیۆ) وای دەبینآ، کە توندوتیژی فشارێکی جەستەییە یان مەعنەوییە و سروشتێکی تاکخوازانە یان کۆمەڵخوازانەی هەیە، لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤە. بەڵام هەردوو زانای کۆمەڵناسی ئەمریکی (گراهام) و (ت. جیر) دەگەنە ئەوەی، کە بڵێن توندوتیژی ڕەفتارێکە بەرەو ئازاردانی جەستەی کەس یان زیان گەیاندن بە ماڵ و موڵک دەبێتەوە، جا چ سروشتێکی تاکخوازانە یان کۆمەڵخوازانە لەخۆ بگرێت.
دکتۆر (فیولیت داگر) پێناسەی توندوتیژی وەک فشارێک دەکات، کە مرۆڤ ناتوانێت خۆی لەبەرانبەری ڕابگرێت، ئەو فشارەش لە دژی ئازادی کەسی جێبەجآ دەکرێت. هەموو ئەوانەش تەعبیر لەوە دەکەن، کە توندوتیژی لە پێناو سەرپێشۆرکردنی لایەنێک لەلایەن لایەنێکی دیکە ممارەسە دەکرآ. بەو مانایەش توندوتیژی دەکەوێتە نێو پەیوەندی هێزی ناهاوتای سیاسی یان ئابوری یان کۆمەلایەتییەوە... جا ئەو جیاوازییە لەسەر بنەڕەتی سێکسی بێت یان بنەچە و تەمەن و ئەوانیکەوە بێت. وەک چۆن بەر کەسێتی مرۆڤ دەکەوێت دواتریش دەبێتە تەگەرەی گەشەکردنی کەسێتی و ئازادییەکانی...
بەڵام دکتۆرە (لەیلا عەبدولوەهاب) بە شێوەیەکی گشتی پێناسەی توندوتیژی بەمجۆرە دەکات: توندوتیژی ڕەفتار یان کردەیەکی دوژمنکارانەیە لایەنێک بە دژی لایەنێکی دیکە ئەنجامی دەدات.

پێناسەی بایۆلۆژی بۆ توندوتیژی:

وەک دەزانرآ کاریگەری بۆماوە لە ڕێگای خانە زیندووە ئاڵۆزەکانی کرۆمۆسۆمەوە بە ئەنجام دەگات، ئەو کاریگەرییەش وەک چۆن لەسەر ئاستی بایۆلۆژی دەردەکەوێت، لەسەر ئاستی زهن و دەروونیشەوەیە. زۆربەی پسپۆران لەوانەش (کرۆک) لەسەر ئەو کاریگەرییانە ڕێککەوتوون، بەڵام کاریگەری گۆڕانکارییە سێکسیەکان ڕەتدەکەنەوە. بەمجۆرە کردەی دوژمنکاری لەژێر کاریگەری نموونەیەک لە دنەدانەوە لەدایک دەبێت، بەڵام ئەو دنەدانە وەک خەسڵەتێکی بۆماوەیی خۆی دەنوێنآ یان وەک هەندآ لە فاکتەری خۆرسکی بۆ نموونە: پەرچەکردار، هەڵچوونە دەروونییەکان و هێزی فیزیکی و چالاکیە هۆرمۆنییەکان... کە ئاراستەیان بەرەو ڕێڕەوی دوژمنکارانە دەچێت.
توێژەران لە نیویۆرک لە ساڵی (١٩٩٨) ڕایانگەیاند، کە گەیشتوونەتە کۆمەڵێک کرۆمۆسۆم، کە پەیوەندییان بە توندوتیژی و دوژمنکاری و تاوانەوە هەیە، بەمجۆرە توندوتیژی بیۆلۆژی، لەو نەخۆشانەدا دەردەکەوێت، کە سکاڵا لە نۆرە تەقینەوەی توندوتیژی یان هێرشئامێز، یان کاولکاری دەکەن. هۆی سەرەکی توندوتیژی بایۆلۆژی بە پێکران یان بریندارکردنی دەماغ لە کاتی ڕووداو، یان پێکران و برینداربوونی دەماغ لە کاتی لەدایکبوون وەسف دەکرێت.

پێناسەی هۆیەکانی ڕاگەیاندن بۆ توندوتیژی:

**هەڵبەتە لایەنی هۆیەکانی ڕاگەیاندن لەنێو تەواوی لایەنەکانی دیکەدا بەگشتی لایەنێکی دیارە، و پێناسەی تایبەتی خۆی بۆ توندوتیژی هەیە. (لۆنیز و فیلش) لە کتێبی (تلفزیۆن لە ژیانی ڕۆژانەدا) بەمجۆرە پێناسەی توندوتیژی کردووە، کە کردەیەکە بە پێکران یان بریندارکردن یان مەرگی کەسی ئەویدیکە دێتە ژماردن.**
**)ئامال کەمال) پێناسەی توندوتیژی میدیایی بەمجۆرە دەکات: هەر هەڕەشەیەکی ئاشکرا بەهۆی بەکارهێنانی هێزی جەستەیی یان کردەوە بە ئەنجام بگات و ئامانجی ئازارگەیاندن بێت بە جەستەی هەر کەسآ یان کۆمەڵآ، ئەو ئازارگەیاندنە بخرێتە ڕوو یان شاراوە بێت بە توندوتیژی ناوزەد دەکرێت. هەروەها توندوتیژی هەندآ لە دیمەنەکانیش دەگرێتەوە، کە لە وێناکردنی ئەنجامدانی ئازارەوە ڕوو دەدات، بەو مانایەش توندوتیژی کۆی ئەو هەڕەشەو ڕەفتارە توندانە دەگرێتەوە، کە ئەگەرچی لەسەر شاشە دەرناکەون، بەڵام لەبەر ئەوەی دەرئەنجامی زیانبەخشیان هەیە دەچنە میانی توندوتیژی میدیاییەوە.**

**پێناسەی ئابوری بۆ توندوتیژی:**

**دیارە پێناسەکردنی ئابوری بۆ توندوتیژی لە هەموو پێناسەکانی دیکە جیاوازترە و بەمجۆرە پێناسە دەکرێت: توندوتیژی دەرئەنجامی ئەو بۆشاییە نەشیاوەیە، کە دەکەوێتە نێوان پێداویستییەکانی خەڵک و ڕازیبوونیان بەوەی، کە دەستیان دەکەوێت، یان بە مانایەکی دیکە توندوتیژی ئەو جیاوازیەیە، کە دەکەوێتە نێوان واقیع و ئەوەی، کە لە ڕووی ئابورییەوە بەدەست دێت.**
**)سامیە قەدری) توندوتیژی ئابوری بەو جۆرە پێناسە دەکات: بەکارهێنانی هێزی فیزیکییە بە مەبەستی ئازاردان و زیان پێگەیاندن، بە بێبەشبوون لە مافەکانەوە بەندە و دەچێتە خانەی بەکارهێنانی دەسەڵاتێکی ناپەسەند، لە پاڵ ئەوەشدا کۆمەڵێک مانای دیکەی لەخۆ گرتووە، هەموو ماناکانیش لە هێرشکردن و دوژمنکاری و نواندنی هێز بەسەر جەستەو ڕەتکردنەوەی ئەویدیکەدا خۆی هەڵدەگرێتەوە.**

**توندوتیژی خێزانی:**

**توندوتیژی خێزانی ڕەفتار یان کردەیەکی دوژمنکارانەیە لە لایەنێکەوە بۆ لایەنەکەی دیکە بە ئەنجام دەگات، هەروەک دەشآ تاک یان کۆ یان چینی کۆمەڵایەتی یان دەوڵەت بە ئەنجامی بگەیەنێت، ئەوەش دەکەوێتە چوارچێوەی هێزێکی ناهاوتای ئابوری یان کۆمەڵایەتی یان سیاسی لە پێناو دەستەبەسەراگرتن و ملپێکەچکردنی لایەنەکەی دیکە لە ئاکامیشدا ئەو لایەنە ناچار بە زیانی مادی مەعنەوی و دەروونی دەکرێت.**
**توندوتیژی خێزان شێوەیەکە لە شێوەکانی بەکارهێنانی ناڕەوایانەی هێز لە لایەن یەکێک یان زیاتر لە ئەندامەکانی خێزان دژ بە ئەویدیکە یان ئەوانیدیکە، بە مەبەستی ئازارپێگەیاندن و ملپێکەچکردن و ڕاونان، بە شێوەیەک، کە لەگەڵ ئازادی و ویستی تاکە کەسی یەکناگرێتەوە.**
**توندوتیژی خێزانی ڕەفتارێکە یەکێک لە ئەندامەکانی خێزان بەرانبەر یەکێکی دیکەی ئەندامی خێزانەکە ئەنجامی دەدات، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە بێت. ئەوەش بەدیاریکراوی زیانگەیاندنە و هەموو جۆرەکانی بێبەشکردنی پێداویستییە بنەڕەتییەکان و ئازادی و ناچارکردن (واتە کەسێک ناچار بکرێت بێ حەزی خۆی کردەیەک ئەنجام بدات) هەروەها جنێودان و لاقەکردن و بریندارکردنی جەستەیی و دەروونی دەگرێتەوە .**

**تیۆری توندوتیژی ڕەمزی.**
**لای پییێر بۆردیۆ**

چەمکی توندوتیژی وەک مەسەلەیەکی مێژوویی بەو هێزەوە بەندە، کە لە سروشت، یان خواوەندەوەیە، وشەی (violence)لە وشەی لاتینی (violentia) وەرگیراوە و مانای توندوتیژی دەگەیەنێت. وشەی ناوبراو لە فۆرمە فیزیکیەکەیەوە لە وشەی (vis) هەڵێنجراوە و تەعبیر لە هێز دەکات. ئەو مانایەش لە زۆربەی فەرهەنگە جۆراوجۆرەکانی زمان بە ئەسڵی وشەی یەکەمەوە بەندە، وەک فەرهەنگی (لاروس Larousse) ئەو فەرهەنگە توندوتیژی وەک خەسڵەتێک بۆ هەموو ئەو کارانەی، کە بەهێز و توندیی پەرگیر ِو دڕندەییەوە بەندە دەخاتە ڕوو، بە خەسڵەتێکی دوژمنکارانەی دادەنێت، خەسڵەتێک، کە تەعبیر لەوپەڕی توندی دەکات و بە زاراوە و ڕەفتاردا گوزەر دەکات و لە بەکارهێنانی هێزدا ڕەنگدەداتەوە. مەوسوعەی (Universalis) فەرهەنگی، توندوتیژی لە کردەیەکی دیاریکراودا دەبیینآ کردەیەک چ وەک قسە یان کردار، کە لەلایەن تاکێک لەبەرانبەر تاکێکی دیکە، یان چەند تاکێک و لایەنێک لەبەرانبەر چەند تاکێک و لایەنێکی دیکە پرۆسیسەی دەکەن... ئەو کردە توندە خۆی لە هێزدا هەڵدەگرێتەوە جا چ فیزیکی بێ، یان ڕەمزی.

توندوتیژی ڕەمزی.

توندوتیژی ڕەمزی لای (بۆردیۆ) توندوتیژییەکی لەسەرەخۆی ڕازیکەر و شاراوە و نەبینراوە، خۆی وەک ڕێکخستنێک لە دەرککردنی ڕەوا و چێژی هونەری و بنچینەکانی ئەدەب هەڵدەگرێتەوە... بۆردیۆ ئەو پێناسەیە وەک ئەزموونێکی خودی و ژانۆژواری تاک نیشان نادات، بەڵکو وەک کۆمەڵێک دیاردەی سیاسی بەرجەستەی دەکات، هەر لەسەر ئەو بنەمایەش بایەخی توندوتیژی ڕەمزی سەرنجمان بۆ خۆی ڕادەکێشآ، لە شێوەکانی توندوتیژی ڕەمزی بۆ نموونە: گوتاری دژ بە بێگانە و ڕەگەزپەرستی و لووتبەرزی ئەرستۆکراتی، ئایدیۆلۆژییەتی شەعبی هەڵبژاردە، یان چینی حاکم، هەژموونگەرایی نێرانە....

پێناسەی توندوتیژی ڕەمزی.

بۆردیۆ لە بارەی توندوتیژی ڕەمزی وەک توندوتیژییەکی نا فیزیکی قسە دەکات و پێیوایە هەر لە بنەڕەتەوە دەشآ ئەو توندوتیژییە لە ڕێگای پەروەردە و فێرکردنی مەعریفە و ئایدیۆلۆژییەوە پرۆسیسە بکرآ، ئەو توندوتیژییە شێوەیەکی نەرم وەردەگرآ و هەستی پێناکرآ، وەک چۆن بە نسبەت قوربانییەکانیش بە نەبینراوی دەمێنێتەوە. بۆردیۆ ڕەخنە لە فیکری مارکسی دەگرآ، چونکە بە ڕای بۆردیۆ فیکری مارکسی بایەخی بە شێوە جۆراوجۆرەکانی توندوتیژی ڕەمزی نەداوە و زێتر شێوەکانی توندوتیژی مادی و ئابوری بە هەند هەڵدەگرآ. چونکە بۆردیۆ پێیوایە توندوتیژی ڕەمزی بە شێوە جۆراوجۆرەکانییەوە کاریگەری لە بواری ئابوریشدا هەیە.
وەک دەزانین توندوتیژی ڕەمزی لەسەر دوو بکەری کۆمەڵایەتی و بە ڕەزامەندییەوە پرۆسیسە دەکرآ، بۆیە ئەو توندوتیژییە دانپێنەنراوە و هەر تەنها وەک مەسەلەیەکی بەڵگەنەویست تەماشا دەکرآ و دەکەوێتە نێو هۆیەکانی پەروەردە و نماکردنە کۆمەڵایەتی و شێوەکانی پەیوەندیکردنی نێو کۆمەڵگاوە. لەو ڕوانگەیەوە دەشآ وەک بۆردیۆ لەو بنەڕەتە حەقیقییە بگەین، کە دەسەڵاتی سیاسی یان هێزی زاڵ بۆ دەستبەسەراگرتن و هەژموون دروستکردن پشتی پێدەبەستآ، هەڵبەتە پشت بەستن بەو میکانیزمەی، کە لە میانی توندوتیژی ڕەمزییەوە خۆی هەڵدەگرێتەوە بە ئاسانترین شێوە پراکتیزە دەکرآ، بە تایبەتی وەک دەزانین هەمیشە هاوگونجانێک لەنێوان بونیادە بابەتگەرایە باوەکان و ئەو بونیادە عەقڵییانەوە هەیە، کە لە ئاستی فیکردا بەدەست دێت.
بەمجۆرە دەبینین توندوتیژی دوو شێوەی سەرەکی هەیە، یەکەم توندوتیژی مادی، بە دیاردە جۆراوجۆرەکانی. دووەم توندوتیژی ڕەمزی، کە بۆردیۆ لە میانی هەندآ هۆکار و بواری چالاکییەکاندا ڕوونی دەکاتەوە و پێیوایە دەوڵەت و

دەسەڵاتی سیاسی بۆ کۆنترۆڵکردن و هەژموونگەرایی پشتی پێدەبەستآ. بەو مانایەش مەحاڵە قسە لە کۆمەڵگایەکی مرۆیی بکەین، کە خاڵیی بێت لە توندوتیژی ئەوەش دیاردەیەکە لە دیاردەکانی مێژووی کۆمەڵگای مرۆیی.

**توندوتیژی ڕەمزی دامەزراوە فێرکارییەکان.**

توندوتیژی ڕەمزی لە نمایانکردن و پێناسەکردنی بە دەوڵەتەوە واتای ئەو پاڵەپەستۆ، یان سەپاندن یان کاریگەرییە، کە دەوڵەت بە شێوەی فەرمانی ناڕاستەوخۆ بەسەر تاکەکان و گروپەکانیدا پرۆسیسەی دەکات. ئەوەش زۆر بە جوانی لە پەروەردە و فێرکردن بەرجەستەیە، بەو مانایەش دەشآ بڵێین سیستمی خوێندن تەعبیر لە بیروباوەڕە بەڵگەنەویستەکانی سیستمی سیاسی دەکات. یان خستنە نێوەوەی پەیوەندی دەسەڵاتە بۆ نێو دەروونی تاکەکان، وەک ئەوەی هەر لە بنەڕەتەوە ئەو پەیوەندییە پەیوەندییەکی سروشتی نێوان ئەو دوو لایەنە بێت .
هەڵبەتە بۆردیۆ بەردەوام دژی سیستمی پەروەردەو فێرکردن و میتۆدی خوێندن دەبێتەوە. بەپێی بیروباوەڕی ئەو ئیتر دەوڵەت با واز لە فێرکردنی فێرکردن و ڕاهێنانی خەڵک بۆ بەدەستهێنانی زانیاری و مەعریفە بهێنآ. قوتابخانە لە هەموو کۆمەڵگاکاندا وەک یەکێک لە دامەزراوە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی خۆی دەنوێنآ، کە بەردەوام لە ناوکۆییەکی تەواو گشتگیر لە کۆمەڵگادا بەپێی ڕێسایەکی دیاریکراو خۆی ڕێکدەخاتەوە و تایبەتمەندی قوتابخانەش بەشێوە مێژووییەکەی دەکەوێتە کایەی پرۆسیسەکردن و فێرکاری و ڕۆشنبیرییەوە، بەمجۆرە قوتابخانە لە بواری نماکردنی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی لەگەڵ دامەزراوی خێزان کارفرمای خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێت. کەواتە قوتابخانە لە کۆمەڵگای مرۆییدا شێوەیەکە لە شێوەکانی دەوڵەت و وەک ئەلتەرناتیڤی خێزان خۆی ڕادەگەیەنێت. بەو مانایەش قوتابخانە لە بواری کردەی فێرکارییەوە یەکێکە لە پێداویستییە ئایدیۆلۆژییەکانی دەوڵەت. مارکس دەڵێت: فیکرە باوەکان فیکری چینە باوەکانە، هەر ئەوانیشن، کە هەژموونیان هەیە. ئەو خەسڵەتە باو و ستەمگەرانەی، کە دەست بەسەر دامەزراوە فێرکارییەکاندا دەگرن، ئەو خەسڵەتە ستەمگەرایەیە، کە لە سیستمی فێرکاری تەقلیدی ماوەتەوە و بورژوازییەت لەدوای سەربەخۆبوونی درێژەی پێدەدات. بەمجۆرە سیستمی پەروەردە و فێرکردن لەسەر ئاستی مۆبیلیزەکردن و ئاراستەکردندا وەک پاشکۆی سێنتەری کۆلۆنی بە پارچە پارچەیی ماوەتەوە، بەدیوەکەی دیکەش چینی دەسەڵاتدار بە شێوەیەکی بەرفرەوان بۆ بەدەستهێنانی ئەو ڕیکوپێکییە بەردەوام لە ڕێگای ئەو دامەزراوەوە دەسەڵاتی خۆی درێژ دەکاتەوە و هەر لەوێشەوە سانسۆری خۆی پیادە دەکات.
کەواتە ئەمڕۆ قوتابخانە ڕۆڵێکی بنەڕەتی لە دووبارە بەرهەمهێنانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە باوەکانی نێو کۆمەڵگا دەگێڕآ، لە ڕێگای هەژموون و هێزی دەوڵەت و دەسەڵاتەوە و ئەوەش هەمیشە شێوەی ڕازیکردن و قبوڵکردن لەخۆ دەگرآ وەک (ئەنتۆنیۆ گرامشی ١٨٩١-١٩٢٣) دەڵێ. یان لە ڕێگای توندوتیژی و زۆرلێکردن بەشێوە ڕەمزییەکەیەوە، وەک بۆردیۆ قسەی لێدەکات.

**توندوتیژی و جیاکاری.**

هەموو توندوتیژییەکی دژ بە ئافرەت وەک پێویست جۆرێکە لە جیاکاری. وەک دەزانین لە بنەڕەتدا ئەو جیاکارییە دەلالەت لە ڕەگەز دەکات، یان ئەو توندوتیژیەیە دەگەیەنێت، کە ڕەگەزی نێر بەرانبەر بە ڕەگەزی مآ پیادەی دەکات. کەواتە ئافرەت لەبەر ئەوەی وەک ڕەگەز جیا دەکەوێتەوە و جۆرێکی دیکەی تایبەتە، بۆیە ئەویدیکەی نێر وەک سەرچاوەی فیتنە سەیری دەکات. کەواتە لە نێوان جیاکاری و توندوتیژی پەیوەندییەکی بنەڕەتی هەیە، ئەو پەیوەندییەش خۆی لەو خاڵانەی خوارەوەدا دەدۆزێتەوە :
-کردەی توندوتیژی دژ بە ژنان وەک جیاکارییەک خۆی لە بێنرخکردنی ژناندا دەبینێتەوە.

-هەموو جیاکارییەک بەرەو توندوتیژی دەچآ... پرنسیپی ملکەچبوونی ژن بۆ مێردەکەی دەرفەتێکی بەرفرەوان بۆ پیاو دەکاتەوە تاکو لەوێدا بە شێوەیەک لە شێوەکان ئازار بە ژنەکەی بگەیەنێت، ئەو ئازاردان و توندوتیژییەش لە بواری یاسای تاوان بە تایبەتی لە سیستمە باوکسالارییەکاندا دەکەوێتە میانی "تاوانی شەرەف"ەوە، ئەوەش وەک بەڵگەیەک بۆ توندوتیژی دژ بە ئافرەتان و هاندانی پیاوان بۆ نواندنی توندوتیژی دژ بە رەگەزی مێینە خۆی دەنوێنآ.

-توندوتیژی دەبێتە پشت و پەنای جیاکاری، زۆربەی پیاوان ئەو توندوتیژییە جەستەییە وەک ئامرازێکی تەقلیدی و شێوازێک لە شێوازەکانی تەمێکردنی ژنان بەکار دەهێنن.

**توندوتیژی رەمزی تلفزیۆن.**

هەڵبەتە ئەمرۆ تلفزیۆن رۆڵێکی بنەرەتی گرنگ لە ژیانی رۆژانەماندا دەگێرآ، ئەویش لە رێگای بەدواداچوونی رۆژانە و سەیرکردنی بەرنامەکان و هەواڵ و یان بە مانایەکی دیکە تەماشاکردنی بەپێی ئارەزوو... بۆیە ئەو ئامێرە بە "میوانی ناچاری" ناو دەبرێت. بێگومان زیادەرۆی نییە ئەگەر بڵێین تلفزیۆن بەشدارییەکی ئەکتیفانەی راستەوخۆ و ناراستەوخۆی لە پەروەردەکردن و ئاراستەکردن و دوارۆژی منداڵەکانماندا هەیە، لەلایەکی دیکەش دەشآ ئاماژە بە زنجیرەیەک میکانیزم بکەین، کە دەیسەلمێنن تلفزیۆن دەستی لە جۆرێک لە جۆرەکانی توندوتیژی رەمزی ئازار بەخش و خراپەکاردا دەبینآ، یەکێک لەو دیاردانەی ئەو توندوتیژییە رەمزییەی، کە تلفزیۆن رۆڵی تێدا دەبینآ ئەوەیە، کە کاتەکان بە کۆمەڵێک شت پڕ دەکاتەوە، کە نە هیچ بایەخێکیان هەیە و نە هیچ سوودێک و نە وەک پێداویستییەکی ژیانیش تەماشا دەکرێن، بەڵکو هەموو هەر تەنها کاتێکی بە نرخی ئێمە بە شتی بێ نرخ ئیستهلاک دەکەن، بەو مانایەش تلفزیۆن دەستی لە وێرانکردنی ئاگایی و هوشیاریدا هەیە و لە هەمانکاتیشدا ئاگاییەکی درۆزنانەمان پێدەبەخشآ، یان کۆمەڵێک زانیاری لەژێر پەردەی یارییەک دەشارێتەوە، کە بە "یاریی شاردنەوە بە هۆی نمایشکردن" ناو دەبرێت.

هەندێجار کۆمەڵێک شت لە تلفزیۆن دەبینین، بەڵام ئەو شتانە هیچ روون نین، یان بە شێوەیەک نمایان دەکرێن، کە هەست بە شاردنەوە و پەناکردن و پێچاوپێچییان دەکرآ، هەڵبەتە هەموو ئەو مەسەلانە لە رێگای وشەی گەورە و وێنەی سەرنجراکێشدا، وێنە و وشەیەک، کە بشآ زۆرترین سەرنجی خەڵک بۆ خۆی رابکێشآ، بەمجۆرە وشە و وێنە هەژموونی خۆی بەسەر بینەردا دەسەپێنآ، هیچ وێنە و وشەیەک نییە بەبێ بەکارهێنانی جولە بتوانآ راڤە و لێکدانەوەی پێویست و خوێندنەوەی پێویست هەڵگرآ، کەواتە تلفزیۆن هەمیشە بە جولەکانی بەرەو خۆی کێشمان دەکات.

بۆردیۆ پێیوایە تلفزیۆن ئامرازێکە بۆ سەرکوتکردنی رەمزی. ئەوەش وەک دەزانین بەپێی ئاستی رۆشنبیریی لە سەیرکەرێکەوە بۆ سەیرکەرێکی دیکە دەگۆرآ... بەڵام ئایا دەشآ وەک ئامرێکی دیموکراسی راستەوخۆ هێزێک بێ بۆ سەربەخۆیی و هەر لەوێشەوە ئاستی مەعریفەی زانستی بینەران بەرز بکاتەوە؟ بێگومان هەموو ئەو مەسەلانە راستەوخۆ پەیوەندی بەو دیوو بینینەوە هەیە، واتە دەکەوێتە پشت تلفزیۆنەوە و پێویستی بە بەرنامە دارشتن و کەسانی پسپۆر و شارەزای بوارە جیا جیاکانی کایەکانی مەعریفە و رۆشنبیرییەوە هەیە، بە مانایەکی دیکە دەکەوێتە دووتوێی ئەو سیستمە رەمزییە نەبینراوەی، کە تلفزیۆن لە رێگایەوە دەجوڵێتەوە، دەبێتە بینین بۆ بینەران. کەواتە ئەوەی لە پشت تلفزیۆن راستەوخۆ ئامادەیی دەنوێنآ ئەو بیروباوەر و شێواز و نۆرمەیە، کە دەسەڵاتەکان هەر یەک بەپێی جیاوازییەکانی خۆی پراکتیزەی دەکات، بەو مانایەش دەشآ بڵێین لە پشت تلفزیۆن سیستمی سیاسی و کۆمەڵایەتی رۆڵی سەرەکی پیادە دەکات. لێرەوە دەگەینە ئەوەی، کە تلفزیۆن هەر تەنها ئامرێک نییە بۆ تۆمارکردنی واقیع، تلفزیۆن هەر تەنها ئامرێک نییە بۆ نیشاندانی حەقیقەت و دروستکردنی حەقیقەت و تەحەکومکردنی مەسەلە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، هەر تەنها ئامرێک نییە بۆ گەیاندنی بیرکردنەوەی خێرا و خۆراکی رۆشنبیریی خێرا... بەڵکو لە زۆربەی کاتەکاندا دەسەڵاتی سیاسی ئەو ئامێرە بۆ بەرژەوەندییە سیاسی و ئایدیۆلۆژییەکانی خۆی بەکاری دەهێنآ و هەمیشە لە رێگای ئەو ئامێرەوە جوانییەکان و بەخششەکانی خۆی بە چەندان رەنگ و دەنگی جیاواز نیشان

دەداتەوە و ئەگەر پێویستیش بکات ڕاستییەکان بە شێوەیەک دەشێوێنی، کە زۆرانێک بە هەڵە بڵێین ڕاستی و بە ڕاستی بڵێن هەڵە، تلفزیۆن لە زۆربەی کاتەکاندا پرۆژەی ئەو هێزە زاڵەیە، کە دەستی بەسەر کۆی کەناڵەکانی ژیاندا گرتووە و بە ئارەزووی خۆی خەڵکی ئاراستە دەکات و بە ئارەزووی خۆی ڕایدەهێنێ.
بۆردیۆ لە کتێبی (تلفزیۆن، میکانیزمێک بۆ گەمەکردن بە عەقڵ) دەڵێ: یەکێک لەو کێشە گەورانەی، کە تلفزیۆن دەیخاتە ڕوو، پەیوەندی نێوان بیرکردنەوە و خێراییە. ئەو دەپرسآ ئایا دەشآ لە هەڵپەکردندا بیر بکەینەوە؟ وەک دەبینین لە زۆربەی جاران بەرنامەکانی تلفزیۆن داوامان لێدەکات بە خێرایی بیر بکەینەوە، واتە دەرفەتێک کورتمان پێدەدا بۆ بیرکردنەوە و وامان لێدەکات لەو ماوە کورتەدا بیر بکەینەوە، بەڵام ئەوە نەک هەر کوشتنی بیرکردنەوەیە، بەڵکو ستەمێکە لە بیریاران دەکرآ، هەر لەو ڕێگایەشەوە دەیانەوآ بیرکردنەوە و بیرکەرەوە بخەنە نێو چوارچێوەیەکی دیاریکراوەوە، یان بە مانایەکی دیکە دەیانەوآ بیرکردنەوەکان بە ئارەزووی خۆیان دەستکاری بکەن و بچووک بکەنەوە.

**بونیاد/هاپیتوس/ پرۆسیسەکردن**
**لای پییێر بۆردیۆ**

"مرۆڤ بە ئازادی لە دایک نابێ، بەڵکو دەتوانآ ئازاد بێ"
سپینۆزا

بێگومان زمان لە کۆیی پەیوەندییە جیاوازەکانیدا زۆربەی جاران بەکارهێنەرانی دوچاری جۆرێک لە دووبارەکردنەوە و گواستنەوە دەکات، هەندێکجار ئەو بنبەستبوون و گواستنەوەیە لە ڕێگای پلان و ڕێتم و بەرجەستەکردنی نیازی دیاریکراو، یان خەفەکردن و چەپاندنی جیاوازەوە کۆمەڵێک گۆڕانکاری بەسەر شێوەی دەربڕینی زماندا دەهێنێت، بەو مانایە زمان بەوە دەناسرێت، کە ئێمە ناچار بە گوتنی دەکەین، بۆیە (سارتەر) زمان وەک وەسیلەیەک بۆ ئێلتیزامبوون دەخاتە ڕوو. کەواتە زمان وەک بەها، ئایدیۆلۆژیەتێکی هەژموندار پێکدێنآ و مرۆڤ والێدەکات لەلایەک بەدوای بکەوێت و لەلایەکی دیکەش لە دووتوێیدا دابخرێت.
) پییێر بۆردیۆ ١٩٣٠-٢٠٠٢) زمان تەنها وەک ڕێگایەک بۆ پەیوەندیکردن سەیر ناکات، بەڵکو وەک میکانیزمێک بۆ دەستبەسەراگرتن، قسەی لێدەکات. بەو مانایەش بەکارهێنانەکانی زمان بەهۆی جێکەوتەی زمان لەنێو پەیوەندییە جیاوازەکانەوە دیاری دەکرێن.

١

تیۆری پرۆسیسەکردن (practice)لە گەڕانەوەی ئەرزش بۆ کارای کۆمەڵایەتی خۆی هەڵدەگرێتەوە، گەڕانەوەی ئەو ئەرزشەش ڕاستەوخۆ وەک پەرچەکردارێک لەبەرانبەر تیۆری بونیادگەریدا وەستاوە، چونکە بونیادگەری خود وەک بەرهەمی بیرکردنەوەیەکی ڕووت سەیر دەکات، نەک وەک دەربڕی واقیع. هەر لەوێشەوە بونیادگەری بونیاد بە هێزی بڕیاردەر دادەنێت و مرۆڤ پشتگوآ دەخات و ملکەچی بونیادی کۆمەڵایەتی دەکات و وەک بەرهەمێکی ئەو بونیادە تەماشای دەکات، بە مانایەکی دیکە هەموو هەوڵدانێکیان بۆ ئەوەیە، کە هەڵسوکەوتی تاکەکان لەبەر ڕۆشنایی بونیادە دەرەکییەکان ڕاڤە بکەنەوە، وەک ئەوەی بونیاد بتوانآ بە شێوەیەکی میکانیکی کار بکات و بتوانآ تەجاوزی ئیرادە و ڕۆحی تاک بکات.
چەمکی پرۆسیسەکردن لای بۆردیۆ جەخت لە پەیوەندی تاکی کارا بە بونیادی کۆمەڵایەتییەوە دەکات، ئەو پەیوەندییەش لە دووبارە بەرهەمهێنانەوەی ئەو بونیادەوە خۆی دەبینێتەوە، کە تاکی کارا پێی هەڵدەستێت. لەلایەکی دیکەش بۆردیۆ هەرگیز توانای تاکی کارا لە گۆڕین و گواستنەوە بەدوور نابینآ، بەڵام پێیوایە گۆڕان پێویستییەکی زۆری بە مەرجی بونیادەوە هەیە. واتە سەرەڕای ئەوەی، کە تاک لە بەرهەمی بونیادی ناوبراودا کاران، بەڵام دەشآ

ئەو خودە (واتە خودی کارا) هەم لە کلتوری فەلسەفەی ئاگایی (باو) دوور بکەویتەوە و هەم لە بەرژەوەندی بونیادیش دابێت (واتە لەبەرژەوەندی بونیادێکی دیکەی بەرهەمهێنراودا بێت) هەر بۆیە بۆردیۆ پرۆسیسەکردنی تاکی کارا لە بەرهەمهێنانی بونیاد لەنێو کایە کۆمەلایەتییەکان بەهەند هەڵدەگرێت و پێیوایە ئەوە تاکە کاراکانن، کە بەردەوام بونیادی کۆمەلایەتی بەرهەم دەهێننەوە و دروستی دەکەن و دەیگۆڕن.

بەمجۆرە کردەی بەرهەمهێنانەوەی بونیاد، لەبەرهەمهێنانەوەیەکی میکانیکانە دوور دەکەوێتەوە و زێتر دەکەوێتە سەر هاوکاریکردنی تاکە کارەکان، ئەو تاکە کارایانەی، کە بونیادی بەرهەمهێنانەوە لە فۆڕمی (هاپیتوس(Habitu دا دەبینن. بەو مانایە هاپیتوس سیستمێکە تاکەکان لە رێگایەوە هەم لە جیهانی دەرەوە دەگەن، هەم هەڵیدەسەنگێنن.

لای بۆردیۆ واقیعی ژیانی کۆمەڵگا دوو ئاستی هەیە، یان دوو بوون دەژی: یەکەمیان کایە کۆمەلایەتییەکانن، کە دەکەونە دەرەوەی تاکەکانەوە و بونیادی سەربەخۆی خۆیانیان هەیە. ئاستی دووەم بریتییە لە واقیعی کۆمەڵگا لە ژیانی تاکەکاندا بەو شێوەیەش هاپیتوش لەیەککاتدا بوونی واقیعی کۆمەڵگا و کایەکانە لە جەستەی تاکدا .

کەواتە بکەری کۆمەلایەتی نەک هەر فەزای کۆمەلایەتی، بەڵکو ئەو کایە (Field) کۆمەلایەتییەش داگیر دەکات کەپرۆسیسەکانی خۆی تێدا دەنوێنآ، ئەوەش لای بۆردیۆ بەو شێوە دەخرێتە ڕوو: پرۆسیسەکردن =(هاپیتوس-سەرمایە) +کایە، بەمجۆرە پەیوەندی دیالۆگئامێزی نێوان بونیاد و پرۆسیسەکردن بەرجەستە دەبێت، ئەو پەیوەندییەش لە ڕێگای هاپیتوسی بکەرە کۆمەلایەتییەکان بە ئەنجام دەگات :

بونیاد هاپیتوس پرۆسیسەکردن

هەمەڕەنگی ئەو پرۆسیسەکردنەش بە هەمەڕەنگی بونیادە کۆمەلایەتییەکان و هەمەڕەنگی بونیادی عەقڵی هاپیتوسەوە بەندە. هەڵبەتە لە کۆمەڵگا کۆنەکاندا ئەو هەمەڕەنگییە کەمتر بەرچاو دەکەوێت و زێتر هاوگونجان قەڵەمڕەوی دەکات، بەڵام لە کۆمەڵگا پیشەسازییەکان هەمەڕەنگی زێتر دەبینرێت.



کۆمەڵگای هاوچەرخ لای بۆردیۆ لە چەندین کایەی هەمەڕەنگ (سیاسی، ئابوری، ڕۆشنبیری، پەروەردەیی، ئەکادیمی...) پێکهاتووە، کۆی ئەو کایە سنوردار و بێ سنوورانە، یان سەربەخۆ و نیمچە سەربەخۆیانە سەر بە یاسا و شێواز و گەمەی تایبەت و بەرژەوەندی بابەتیانەی خۆیانن. هەر یەک لەو کایە جۆراوجۆرانە بکەری تایبەت بەخۆی هەیە، ئەو بکەرانەش سروشتی کارەکانیان بەپێی کایەکان دەگۆڕێت، وەک چۆن هەندێجاران تێکەڵ بەیەکتریش دەبن، بەڵام ئەوەی چەمکی کایەکان قووڵتر دەکاتەوە چەمکی جیاوازییە و ئەو چەمکەش لە ڕێگای چەمکی ستراتیژییەتەوە (Strategy)زێتر بەرجەستە دەبێت. بەو مانایەش بۆردیۆ دەیەوآ بڵێت پرۆسیسەکردنی بکەرە کاراکان ناکەوێتە بەرانبەر یاسای دیاریکراو و سەپێنراوەوە، بەڵکو بە پلان و ستراتیژییەتەوە بەندە. واتە پلان و ستراتیژییەت نە بە ئاڕاستەکردنەوە بەندە، نە بە شێوە میکانیکییەکانەوە... ستراتیژییەت لەلایەن بکەرەکانەوە ئاڕاستەکردنێکی بێ مەبەستانە و بێ هۆ لەخۆ دەگرێت.

بۆردیۆ ستراتیژییەت لە دوو شێوازدا دەبینآ: ستراتیژییەتی دووبارە بەرهەمهێنانەوە و ستراتیژییەتی گوازتنەوە. یەکەمیان ئامانجی پارێزگاریکردنی بارودۆخی کۆمەلایەتی و باشکردنییەتی، پشت بە قەبارەی سەرمایە و حاڵەتی میکانیزمی دووبارە بەرهەمهێنانەوە دەبەستێت: وەک یاساکانی بۆماوە، بازاڕی کارکردن، سیستمی فێرکردن.. حاڵەتی ئەو میکانیزمەش بە حاڵەتی پەیوەندی هێز، لەنێوان چینەکانەوە دەلکآ. بەڵام ڕەهەندی دووەمی ستراتیژییەت لێپرسراوی بزاڤە ناوەکییەکانی فەزای کۆمەلایەتییە، لەوانەش: دووبارە گواستنەوەی سەرمایەی ئابوری بۆ سەرمایەی فێرکردن (سەرمایەی فێرکردن کۆی ئەو ساڵانە دەگرێتەوە، کە فێرکار لە سیستمی فێرکردندا بەسەری دەبات، ئەوەش بەرە بەرە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە زیاد دەبێت) گواستنەوەی ناوبراو کردارێکە زێتر دەوڵەمەندەکان بۆ پارێزگاریکردن لەبەرژەوەندییە جیاکارەکانیان بایەخی پێدەدەن جا چ بەشێوە ڕەواکەی یان بەشێوەی جۆراوجۆری

ناڕەوا. مەبەستی بۆردیۆ لە بەرژەوەندی هەر تەنها بەرژەوەندی ئابوری نییە، بەڵکو بە شێوەیەکی بەرفرەوانتر لەو چەمکە دەڕوانێ و دەیخاتە دووتوێی بەرژەوەندی ڕەمزی و قازانکردنی ڕەمزییەوە .

٣

هەموو کۆمەڵەیەک بارودۆخی کۆمەلایەتی خۆی هەیە و پەیوەندی بە بارودۆخەکانی دەوروبەرەوە دەکات، ئەوەش بە کایەکانی فەزا دەچوێنێ، بۆیە کۆمەڵگا بە زاراوەی فەزای کۆمەلایەتی ناو دەنێ، بارودۆخی ڕێژەیی لەنێو ئەو فەزایەدا دەبێتە دیاریکەری ناسنامەی بکەر و کۆمەڵی کۆمەلایەتییە جۆراوجۆرەکانەوە. کەواتە زاراوەی کایە لای بۆردیۆ دەکەوێتە سەر حاڵەتی ململانێی نێوان دوو بکەری کارای نایەکسان لە هێز بەسەر سەرمایەدا، جا ئەو سەرمایەیە هەر جۆرێک بێت، بۆیە کۆمەڵگا لە پەیوەندی هێزدا دەبینێتەوە هێزێک، کە دەکەوێتە نێوان چینەکانی کۆمەڵگاوە، ململانێ بۆ بەدەستهێنانی ئەو هێزەش لەپێناو جیاکاری ئابوری و ڕۆشنبیریی زاراوەی کایەی کۆمەلایەتی گشتییە، ئەو کایە گشتییانەش بەرەو کایەی فەرعی دابەش دەبن، وەک کایەی فێرکردن، ئابوری، کایەی بەرهەمهێنانی ڕۆشنبیریی، کایەی ئایین ...

بۆردیۆ سێ قۆناغ بۆ شیکردنەوەی کایەی کۆمەلایەتی دەخاتە ڕوو: یەکەم، پێویستە ئاستی کایەکە لە بەرژەوەندی بە کایەی بڕیاردەر، کە کایەی سیاسییە دەستنیشان بکەین، چونکە ئەو کارە ڕوونی دەکاتەوە، کە ئەو کایەیە چ مانا و بایەخێکی لەبەرانبەر کایەکانی دیکەدا هەیە. دووەم، پێویستە لەپاش ئەوە وێنەیەکمان لەسەر پەیوەندییە بابەتییەکانی نێوان پێگە جیاوازەکان لەبەر چاو بێت، کە لە کایەیەکدا هەن. واتە پێویستە بزانین شەڕە ڕەمزییەکانی ناو کایەکە لەسەر چین. سێیەم، دەبێت لە هاپیتوسی بکەرە کۆمەلایەتیەکان بکۆڵینەوە. واتە پێویستە بزانین چ هەڵوێستێک لە ناو کایەکەدا بڕیاردەرە و توانای دەستنیشانکردنی جۆرەکانی سەرمایەی ناو کایەکەی هەیە .

٤

هەڵبەتە تێڕوانینی بۆردیۆ بۆ سەرمایە (Cabital) زۆر بەرفرەوانترە لەوەی، کە لە ئابوریناسی مارکسیدا دەبینرێت، چونکە چەمکی سەرمایە وەک بەدیهێنەری پەیوەندی و ئاڵوێری و سەودا تەماشا دەکات، ئەو تێڕوانینەی بۆردیۆ بۆ سەرمایە بۆ تێگەیشتن لە دنیای کۆمەلایەتی زۆر بە سوودتر دەکەوێتەوە. بۆردیۆ پێیوایە هەموو ئەو هێزەی، کە وەک میکانیزم لە پرۆسەی ململانێی کۆمەلایەتی بەکار دەهێنرێت بۆ سەرمایە دەگەڕێتەوە. بۆیە چەمکی سەرمایە هەموو جۆرە خاوەندارییەک لەخۆ دەگرێت، کە بکەرەکان پرۆسیسەی دەکەن. بۆردیۆ جگە لەسەرمایەی ئابوری قسە لەسەر شێوەی جۆراوجۆری سەرمایە دەکات لەوانەش سەرمایەی ڕۆشنبیریی، ئەو سەرمایەیەش دابەشی دوو جۆر دەکات، یەکێکیان بۆماوەیە و هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، کە تاک لەمیانی گەشەکردنی کۆمەلایەتییەوە بەدەستی دەهێنێت، وەک ڕەگەزەکانی بونیادی عەقڵی و دەستەواژەی زمانەوانی. ئەویدیکەشیان وەرگیراوە و هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، کە تاک لە ڕێگای توانا و بەها و فێربوونەوە بەدەستی دەهێنێت.

هەڵبەتە بۆردیۆ پێماندەڵێت چۆن سەیری سەرمایەی ئابوری دەکەین، بە هەمان شێوەش سەیری سەرمایەی ڕۆشنبیریی بکەین، بە تایبەتی ئەوەی، کە پەیوەندی بە کەڵەکردنەوە هەیە. بەو مانایەش دەیەوێ بڵێ سیستمی ئابوری لەپشت سەرمایەی ڕۆشنبیرییەوەیە، بەلام سەرمایەی کۆمەلایەتی کۆی بەیەکەوە بەندبوون و پەیوەندی کۆمەلایەتی بکەرەکان لەخۆدەگرێت. ئەو پەیوەندییە بەرانبەرانەی تاک بە ئەوانیدیکەوە بریتییە لە تۆڕێکی کۆمەلایەتی، کە بەهۆی سەرمایەی گشتییەوە پشتیوانی لە تاکەکان دەکات، بنەمای ئەو ڕەوایەتی و پشتیوانییەش بۆ بیروباوەڕ و بڕوابوون دەگەڕێتەوە. هەڵبەتە لەو بارەدا هەموو جیاوازییە چینایەتییەکان و جیاوازییەکانی دیکەش وەک سەرمایەی ڕەمزی تەماشا دەکرێت و مافی جیاکاری خۆی لە پەیوەندی و بڕوابوون دەخەملێنێ. بەلام سەرمایەی سیاسی، کە وەک یەکێک لە سەرمایە ڕەمزییەکان تەماشا دەکرێت، جگە لە سەرمایەی ئابوری، کۆمەلایەتی، ڕۆشنبیریی شتێکی دیکە نییە، واتە

ئەو جۆرە سەرمایەیە بەپێی شێوازیکی تایبەتی وەرگرتن بە فەرمی دەناسرێت و دانی پێدادەنرێت. بە مانایەکی دیکە هەر جۆرێکی سەرمایەی ئابوری و رۆشنبیریی و کۆمەلایەتی بە پلەی جیاواز وەکو سەرمایەی ڕەمزیش بەرجەستە دەبن. بایەخی سەرمایەی ڕەمزی لە شیکردنەوەی کۆمەلگادا جوانتر دەردەکەویت.

سەرچاوە و پەراوێزەکان:


١ - جان جاک لوسیرکل، عنف اللغة، ترجمة و تقدیم: د. محمد بدوی، النظمة العربیة للترجمة، بیروت- لبنان..

٢ - فلسفة الجسد، میشیلان مارزانو، ترجمة، نبیل ابو یٌعب، بیروت.

٣ -علاقه الوعی و الجسد، ٢/٧/٢٠٠٧. و سبینوزا باروخ او بندیکت ١٦٣٢-١٦٧٧، بروانە ئینتەرنێت .

٤ - فلسفة الجسد، میشیلان مارزانو...

٥ - فریدیریک نیتشه، هکذا تکلم زرادشت، ترجمة، فلکس فارس، دار القلم، بیروت- لبنان.

٦ - رولان بارت، مغامرة فی مواجهه النص، تالیف، فرانک ایفرار و اریک تینه، ترجمة، د. وائل برکات، دار الینابیع، دیمشق، ط١.

٧ - سعید بوخلیط، سؤال الفلسفة! فی افق لعبة وجودیة صمیمیه، بروانە: سایتی گوگڵ.

٨ - امل فؤاد عبید، جیل دولوز والسؤال الفلسفی، شبکه النبا المعلوماتیة- الجمعة ٨ /کانون الرول /٢٠٠٦ -١٦ / ژی القعدة /١٤٢٧.

٩ - بونتی, موریس میرلو , المرئی واللامرئی , ت. د. سعاد محمد خضر, دار الشؤون الثقافیة العامة, بغداد.

١٠ - حنا عبود، تفاحة ادم، دراسه فی النظریة الفلسفیة عند د.ه. لورانس، دار المسیرة- بیروت.

١١ - فروید سیغموند Freud Sigmund ١٨٥٦ -١٩٣٩ پزیشکی دەروونی نەمساوی، بە بەناوبانگترین زانای دەروونی لە فیکری نوآ دێتە ژماردن. دامەزرێنەری ڕێبازی دەروونشیکارییە.(Psychoanalysis)

١٢ - حنا عبود، تفاحة ادم، دراسه فی النظریة الفلسفیة عند د.ه. لورانس، دار المسیرة- بیروت.

١٣ -م انیفستۆی شارستانێتی دیموکراتی، ١، عەبدوڵلا ئۆج ئالان، و: لوقمان عەبدوڵلا، چاپی یەکەم،٢٠٠٩، ل٢٠٦.

١٤ - ژن، پیاو، ئاکاری سێکسی لە لانکەی شارستانیەتەکاندا، ویل دورانت، وەرگێرانی لە فارسییەوە: دلشاد خۆشناو، لە زنجیرە بلاوکردنەوەکانی یەکێتی ژنانی کوردستان، ٢٠٠٩.

١٥ - زۆربەی زۆری ژنگەراکان پێیانوایە فێمینیزمگەرایی بزاڤێکی شەعبیە ئامانجی لابردنی ئەو تەگەرانەیە کە لەسەر بنەمای پشتاوپشتگەری و پلەوپایەی کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیریی و ئایینی جێگیر کراون. ئەو بابەتانەی کە فێمینیزم لە کۆمەلگای پەترپاکیدا بە ناوەڕۆکی خۆی دەزانآ بەشتبوون و بەشتبوونی سێکسییە (واتە کردنی ژن بە کالای سێکسی) و چەوسانەوە... بۆ زێتر شارەزایی بڕوانە: ویکیبیدیا، الموسوعه الحره، انپویە، مارس ٢٠١٠.

١٦ - فیمینیزم، جیەن فریدمەن، وەرگێرانی، فەرشید شەریفی، وەزارەتی ڕۆشنبیریی، بەرێوەبەرایەتی خانەی وەرگێران، چاپخانەی کارۆ.

١٧ - ئایدیۆلۆژیا و بزاڤە فێمینیزمەکان چەندان جۆرن: فێمینیزمی ڕادیکالی، لیبرالی، باشوری، ژینگەیی، ئەفسانەیی، توندگەرا، یەهودی، مەسیحی، ئیسلامی.. لە تیۆریسنەکانیشیان بۆ نموونە: جون ستیوارت مل، سیمون دی بوفوار، جیرمین غریر، قاسم امین.. بۆ زێتر شارەزایی بڕوانە: ویکیبیدیا، الموسوعه الحره، انپویە، مارس ٢٠١٠.

١٨ - مەسەلەی هۆمۆسێکسوالەکان لە ژێر ناوی (اتفاقیة القضاء علی کافة اشکال التمییز ضد النساء) جێگای بۆ کراوەتەوە، ئەوەش دوای ئەوە هات کە (نیکۆلاس تۆنون)ی ئوسترالی هۆمۆسێکسوالێ ڕەخنەی لە پەیماننامەی نێو دەولەتی مافی مرۆڤ گرت، کە هیچ پاراستنێکی مافی ئەوانی تێدا نییە و داوای جێکردنەوەی مافی هۆمۆسێکسوالەکانی لەنێو مافی مرۆڤ کرد.

١٩ - بۆ زێتر شارەزایی و بەدواداچوون بڕوانە: فیمینیزم، جیەن فریدمەن، وەرگێرانی، فەرشید شەریفی. ە. س. پ. ل٣٦،٢٤.

٢٠ - جێندەر Gander لە ڕۆشنبیری ئینگلیزی هاتۆتە بەرهەم، ئەو وشەیە ئەسڵی لاتینییە، لە زمانی عەرەبی وشەی (الجنوسە)ی بۆ بەکار دەهێنن. ڕێکخراوی "تەندروستی جیهان" پێناسەی جێندەر بەوە کراوە کە زاراوەیەکە بۆ وەسفکردنی تایبەتمەندییەکانی پیاوان ئافرەتان بەکار دێت، پەیوەندی بە جیاوازی ئەندامەکانیانەوە نییە، لەلایەکی ترەوە مەوسوعەی بەریتانی لەماددەی جێندەردا پێناسەی وشەکەی کردووە بەوەی هەستی مرۆڤ بەوەی نێرە یان مآ ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەندامی نێرینەی هەیە یان مێیینە بەڵکو ناسنامەی جێندەریی لەکاتی لەدایکبوونەوە دیاری ناکرێ بە نێرینە و مێینە بەڵکو لایەنی نەفسی و کۆمەڵایەتی دەبنە پێکهێنەری ناسنامەی جێندەری ئەو کەسە کاتێک لەمنداڵیەوە گەشە دەکات.

بەپێی ئەو پێناسەی مەوسوعەی بەریتانی: نێرنەیی و مێینەیی پەیوەندی بەلایەنی ئەندامیی نێرنە و مێنەوە نییە بەڵکو مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتییە، ناسنامەی ئەندامیی بۆ تاک هاوتەریبە لەگەڵ ئەوەی کە هەست بکات نێرە یان می، بەڵام ئەم ناسنامە ئەندامییە لەگەڵ سروشتی لایەنی نەفسی ڕۆڵی کۆمەڵایەتی هاوتەرب نییە. بۆ زێتر شارەزایی بڕوانە ئەو سەرچاوەیەی خوارەوە :

٢١ - لێکۆڵینەوەیەکی خێرا لەسەر "جێندەر" ئامادەکردنی: سۆران عومەر، بڕوانە سایتی ماڵێک لە ئاسمان.

٢٢ - جلبير غرانغيوم، الرب المقلوب واللغة الممنوعە، ترجمة: محمد اسليم، صدرت هذه الترجمة بمجلة الفكر العربى المعاصر.

٢٣ - ژن، پیاو، ئاکاری سێکسی لە لانکەی شارستانیەتەکاندا، ویل دورانت، وەرگێرانی لە فارسییەوە: دلشاد خۆشناو، لە زنجیرە بڵاوکردنەوەکانی یەکێتی ژنانی کوردستان، ٢٠٠٩.

٢٤ - یەکێکە لە گەورەترین ڕۆشبیرانی فەرەنسی کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم، لە ٢٢ی یەنایەری ساڵی ٢٠٠٢ لە تەمەنی ٧٢ ساڵیدا کۆچی دوای کردووە. بۆردیۆ بە سیاسەتەوە پەیوەست بوو، وەک چۆن بە قووڵی چووبووە نیو فیکر و مەعریفەوە.

٢٥ - بيار بورديو، الهيمنه الزكوريه، ترجمة: د. سلمان قعفرانى، مركز دراسات الوحدة العربية، الحمراء- بيروت، ط ٢٠٠٩ .

٢٦ - پول ريكور، زندگی در دنیای متن، ترجمة، بابک احمدی، چاپ چهارم، ێ ٩٧-١١١. و: دانا لەتیف شوانی .

٢٧ - التنمط الجنسى فى المجتمع و فى ادب الاطفال، ترجمة: لميس كنجى، مراجعة: سليمان حسين، جريدة الاسبوع الادبى، العدد ٨٣٢ فى ٢٠٠٢/١١/٩.

٢٨ - ژن، پیاو، ئاکاری سێکسی لە لانکەی شارستانیەتەکاندا، ویل دورانت، وەرگێرانی لە فارسییەوە: دلشاد خۆشناو، لە زنجیرە بڵاوکردنەوەکانی یەکێتی ژنانی کوردستان.

٢٩ - يوسف المحسن، الهيمنة الذكورية كبنية سوسيو- ثقافية، موقع محمد اسليم، ٢٧/يناير ٢٠٠٢.

٣٠ - بيار بورديو، الهيمنة الذكورية، ترجمة: د. سلمان قعفرانى.

٣١ - الجنس الاول/ لإيريك زيمور: لم تترجل المراه فتانث الرجل، رودولف ضاهر، هەڵبەتە ئەو ناونیشانە لە ناونیشانی کتێبەکەی سیمۆن دۆبۆڤوار بە ناوی ڕەگەزی دووەم وەرگیراوە, بڕوانە سایتی گۆگڵ لە ئینتەرنێت.

٣٢ - بيار بيرنبوم، معجم علم السياسة والموسسات السياسية.

٣٣ - د. العطرى عبد الرحيم العلوم الاجتماعية و التحولات السياسية: فى الحاجة إلى السوال السوسيولوجى"

٣٤ - على سالم/ عن جريدة: النهار، الجمعة ٨ شباط ٢٠٠٢ .

- صبحى درويش كاتب سورى عن انترنيت .

٣٥ - شبكه النبا المعلوماتية- الثلاثاء ٢٤ نيسان/٢٠٠٧ -٧/ربيع الثانى/١٤٢٨.

٣٦ - بورديو، بيير، اسباب عملية، ت: انور مغيث، طرابلس: الدار الجماهيرية للطبع والنشر، ١٩٦٦. ص: ٢٠٢ - ٢٠٣. هەڵبەتە چەمکی هاپیتوس لەلایەن بۆردیۆ دانەهێنراوە بەڵکو بەرفرەوانکراوە، چونکە ئەو چەمکە لە کارەکانی ئەرستۆ، نۆربێرت ئەلیاسNorbert Elias ، ماکس فیبێر، ئەدمۆند هۆسرەل.Edmund Husserl

٣٧ - پییەر بۆردیۆ و کۆمەڵناسی فەلسەفی، ڕێبوار سیوەیلی، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چ ٢٠١٠ هەولێر.
٣٨ - بۆردیۆ پێیوایە هەموو جۆرێک لە سەرمایە دەبێتە شوێنی ململانێی لە کایەکەی خۆیدا.
٣٩ - انصار، بیار، العلوم الاجتماعیة المعاصره، ت: نخلة فریفر، ط١، بیروت: المرکز الثقافی العربی.
٤٠ - بوردیو، بییر، الرمز والسلطة، ت: عبد السلام بنعبد العالی، ط٢، الدار البیضاء: دار توبقال، ١٩٩٠.

**شاعیر و ڕەخنەگر و وەرگێڕ**

**لە بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر:**

- سێبەری ئاو- کۆمەڵە شیعر، هەولێر/ ١٩٩٥.
- بازەمەنێک لە تەماشاکردنی ئاو بەڕۆژوەبین- قەسیدە، هەولێر/١٩٩٦.
- ئاگایی زمان زمانی ئاگایی- لێکۆڵینەوە- لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی/١٩٩٩.
- تەنیا مەرگ - سێ دەقی شانۆیی وەرگێردراو لە عەرەبییەوە- لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژ/١٩٩٩.
- تەنیا ئاو تەنیا باران- کۆمەڵە شیعر، لە عەرەبییەوە- لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژ/٢٠٠١.
- پەیبردن بە ژیان, پەیبردن بەشیعر بوون- لێکۆڵینەوە- لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی/٢٠٠١.
- شیعریەتی دەق- ئەدۆنیس- وەرگێرانی لە عەرەبییەوە، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژ، سلێمانی/٢٠٠٢
- مرۆڤ لە ڕوانگەی فرۆید-وەرگێرانی لە عەرەبییەوە- دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی/٢٠٠٢.
- خەیاڵی زمان - لێکۆڵینەوە، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی/٢٠٠٤.
- شوێنکاتی یەکەم لە دووەم ء ئێستای سەرگوڕە، لێکۆڵینەوە- لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریو ئەدەبی نما، هەولێر/٢٠٠٤.
- ئەدۆنیس- دوو گفتوگۆی فیکریء ئەدەبییە- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە- لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، هەولێر/٢٠٠٥.
- خوێندنەوەی پەراوێز, پەراوێزی خوێندنەوە- نومایشکردنی فیکری سەردەم لە چەند پەراوێزآ- لێکۆڵینەوە- لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوە، سلێمانی،/٢٠٠٥.
- درید-ڕەخنە لە سێنترالیزمی خۆرئاوایی- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە- لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی/٢٠٠٥ .
- نووسین خۆکوژییەکی تەواو نەکراو،
کۆمەڵێک وتارو گفتوگۆی ئەدەبیء فیکرییە- وەرگێرانی لە عەرەبییەوە- لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، هەولێر/٢٠٠٦.
- ئەدۆنیس.. ئەفسوونکاری وشەکان، کۆمەڵێک گفتوگۆی ئەدەبی و فیکرییە- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای وەرگێران، هەولێر/٢٠٠٨.
- زمان/گێڕانەوە، کۆدی دافنشی، لێکۆڵینەوە، کتێبی گیرفان ژمارە ٤١، وەزارەتی ڕۆشنبیریی و لاوان، بەڕێوەبرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێر، چاپخانەی ڕۆشنبیریی،٢٠١٠. هەولێر.
- شەڕی زمان، لە پێناو تەئویلکردنی دەق، لێکۆڵینەوە، بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوە، سلێمانی، ٢٠١٠.
- میوانی ئاو، کۆمەڵە شیعر، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، هەولێر، ٢٠١٠ .

- **زمان/بوون/شیعر، لێکۆڵینەوە (خوێندنەوەیەک بۆ ئەزموون و تایبەتمەندی شیعری هاشم سەراج) دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠١٠.**

**ئەو بەرهەمانەی ئامادەی چاپکردنن:**

- **قەسیدەی وێنەیی، شیعری خەزعەل ئەلماجدی، وەرگێڕان.**
- **شیعرییەتی عەرەبی، ئەدۆنیس، وەرگێڕان.**
- **لەبەر باران، کۆمەڵە شیعر.**
- **خەیاڵی ڕەوانبێژی، دەق و پراکتیزەکانی وەرگر، لێکۆڵینەوە.**